# هەڵەبجە

(1930 ـ 1889)

**لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە**

**نووسینی:**

**عادل صدیق**

2008 **زایینی** 1429 **کۆچی**

**ناوی کتێب:** هەڵەبجە (1889-1930)، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە

**نووسینی:** عادل صدیق

**ژمارەی سپاردن:** (50) ساڵی (2008)

**شوێنی چاپ:** کۆمپانیای چاپو پەخشی نوسەر

**نۆرەی چاپ:** یەکەم

**ساڵی چاپ:** 2008

**نەخشەسازی بەرگ:** فازل قەرەداغی

**نەخشەسازی ناوەوە:** ئیدریس سیوەیلی

**لە بڵاوکراوەکانی:** پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە (28)

**ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت:** www.tishkbooks.com

**ئیمەیلی پرۆژە:** info@tishkbooks.com

tishkbooks@yahoo.com

PDF 4 KURD


## ناوەڕۆك

## لیستی هێما و کورتکراوەکان

| | | |
|---|---|---|
| لاپەڕە | = | ل |
| پەراوێز | = | پ |
| بەرگ | = | ب |
| چاپ | = | چ |
| وەرگێڕ | = | و |
| ترجمة | = | ت |
| طبع | = | ط |
| دکتۆر، الدکتور | = | د |
| گۆڤار | = | گ |
| ڕۆژنامە | = | ڕ |
| ژمارە | = | ژ |

## پێشەکیی بۆ لا پەڕەکانی مێژووی هەڵە بجە

ئەم کتێبەی کاکە (عادل صدیق)، سومبولی خوێندنەوەی مێژووی هەڵەبجەیە، کە بە شێوەیەکی ئەکادیمیو شیکاری بابەتیانە نووسیویەتیو توانیویەتی شارەزایانە مامەڵە بکات لەگەڵ رووداو و بەسەرهاتە مێژووییەکاندا، دابەشکردنو شێوازی خستەڕووی باسەکانی سەرنجڕاکێشنو خوێنەر ماندو ناکەن، لەگەڵ ئەوەشدا مۆرکی ئەکادیمیبوونی خۆی پاراستووەو وەك دوا وێنەکانی نمایشی مێژووی هەڵەبجە تا کۆتایی سییەکان دەنووسێت، ئومێدەوارم کە دەرفەتی ئەوەشی بۆ برەخسێت تا بتوانێت ئەڵقەکانی تری دوای ئەو رۆژگارانەش بنووسێتەوە، بە هەمان ئەو ئەمانەتەوە کە ئەم پەڕاوە جوانەی پێ نووسیوە.

پێش کاکە عادل، کەسانی تریش لەسەر مێژووی ئەم شارە کۆسکەوتووەیان نووسیوە، بەڵام کەسیان بە خۆشمەوە نەیانتوانیوە بەم شێوە دابەشکردنو ڕیزبەندیو پێکەوەگرێدانە پڕ لە وردیو درشتییە باس لە رووداوەکان بکەین، ئەوەی سەیری پەڕاوەکە دەکات بێلایەنیو یەکلابوونەوەی نووسەری بۆ دەردەکەوێت.

بەڵام سەرباری ئەم لایەنە ئیجابیو باشانە هیچ بەرهەمێك بێ کەموکوڕی نابێت، ئەم بەرهەمە ناوازەش بێ لەکە نییە، کە بەڕای من زۆر وردکرنەوەی کێشەو رووداوەکان بە ناخی پاڵەوانەکانی مێژوودا، زەقترین خاڵی جێگەی سەرنجی منە، کە زۆر جار کەسێتیەکان دەڕۆنە دەرەوەی هەڵەبجەو دەبنە بەشێك لە ڕووداوە مێژوویەکانی شارێکی ترو شارۆچکەیەکی ترو مەنزڵگابەکی تر.

دەبوایە تا ئەندازەیەکی زۆر نووسەر لەم ڕووەوە ئەو شێوازەی بەکارنەهێنایە، کە لە کۆتایی باسەکەدا خوێنەر ماندوو دەکات بە دوای ڕووداوەکانو کەسەکاندا پێشبڕکێ بکات بۆ تەواوکردنی باسەکان.

لەگەڵ ئەو سەرنجەشدا، لە بەکارهێنانو گواستەوەی پڕ لە ئەمانەتی نووسەردا، دەردەکەوێت کە نووسەر چەند لەگەڵ ئەم باسەدا ماندوو بووەو رەزامەندی کادیری توێژینەوەی کۆلێژەکەی خۆی پێوەرگرتووە. ماوەتەوە کە خۆشەویستیو ڕێزی هەڵەبجەییەکانیش بۆ خۆی مسۆگەر بکات، کە ئومێدەوارم ئەو خەڵاتەش وەربگرێت.

**بەکر حەمەصدیق عارف**

## پێشەکیی

لەگەڵ کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی میرنشینی ئەردەڵانو دواتریش لەناوچوونی دەسەڵاتی میرنشینی بابان، لە سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا، وردە وردە قورسایی دانیشتوان لە خورماڵ (گوڵعەنبەر)ەوە گوازرایەوە بۆ هەڵەبجە، بەتایبەتی لە دوای هاتنو نیشتەجێبوونی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکانی سەر بە تیرەو هۆزەکانی عەشیرەتی گەورەی جاف، پاش وەرگرتنی ڕەزامەندی (حەمە پاشا)ی سەرۆکی ئەو عەشیرەتە لەسەر ئەو نیشتەجێبوونەیان لە شاری هەڵەبجەی ئەوسەردەم. لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی دانیشتوانی هەڵەبجە لە ڕووی کارگێڕیو سیاسییەوە، بەهەمان شێوە شوێنی ناحیەی خورماڵی گرتەوەو بووە مەڵبەندێکی گرنگی کارگێڕی لە ناوچەکەدا، هەر لەسەردەمی جافەکاندا بوو هەڵەبجە کرا بەمەڵبەندی قەزا، سنوورەکەی هەر لە قەزای (خانەقین)ەوە تا ناحیەی (پێنجوێن)ی دەگرتەوە، کە خودی ناحیەی (پێنجوێن)یشی دەگرتەوە، لە باکوری ڕۆژئاواشەوە ناحیەی سرۆچك (بەرزنجە)ی دەگرتەوەو بەهەمان شێوە ئەمیش لەڕووی کارگێڕییەوە سەر بە قەزای هەڵەبجە بوو.

شاری هەڵەبجە، بۆ ماوەی دەیان ساڵ بوو بە گرنگترینو سەرەکیترین مەڵبەندی نیشتەجێبوونی جافەکان، لەم شارەدا چەندین کەسایەتی دیارو بەناوبانگی سەر بەم عەشیرەتە هەڵکەوتوون کە شوێن دەستیان لە ڕووداوەکانی ناوچەکەدا دیاربووە، لەوانەش (محەمەد پاشای جاف، مەحمود پاشای جاف، عوسمان پاشای جاف، عادیلە خانی خێزانی عوسمان پاشا..... هتد). ئەمانە لەئاست ئەو ڕووداوو گۆڕانکارییانەی کە لەم ناوچەیەدا ڕوویانداوە چ لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیو چ لە سەردەمی دەسەڵاتداریێتی ئینگلیزەکانداو دواتریش شۆڕشە یەك لەدوای یەکەکانی شێخ مەحمودا تەماشاکەر نەبوونو ڕۆڵی بەرچاویان هەبووە.

سەرەڕای مێژوویەکی دوورو درێژی ئەم شارە، بەڵام تا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی زانستی چڕوپڕ لەسەر مێژووی سیاسی ئەم شارە ئەنجام نەدراوە، ئەوەشی تا ئێستا لەسەر مێژووی هەڵەبجە نووسرابێت زۆر کرچو کاڵەو زۆربەیان ڕوویەکی ڕووداوەکانیان باسکردووە.

هەموو ئەم هۆکارانە هاندەرو پاڵنەرم بوون لە هەڵبژاردنی وەها بابەتێکدا کە بیکەم بە باسی دەرچوونی خۆم لە دواساڵی خوێندنم لە زانکۆدا، بەتایبەتی بارودۆخی سیاسیو کارگێڕی ئەم ناوچەیە.

بەشێوەیەکی گشتی ئێمە لێرەدا هەوڵمانداوە بەپێی توانا سوود لەو سەرچاوەو بابەتانە وەرگرین کە بە شێوەیەك لە شێوەکان لەسەر مێژووی ئەو شارەیان نووسیوە.

جگە لە دەروازەی بابەتەکە، کەخۆی لەباسی جوگرافی شارەکەدا دەبینێتەوە، ناوەڕۆکی ئەم لێکۆڵینەوە لە سێ بەشی سەرەکی پێکهاتووە کە بریتییە لەم بەشانەی خوارەوە:

بەشی یەکەم: لەم بەشەدا هەوڵمانداوە بنەڕەتی ناوی هەڵەبجەو مێژووی کۆنو نوێی شاری هەڵەبجە ڕوون بکەینەوە، بە بەڵگەوە وەك ئەوەی لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هاتووە، ئەم بەشەش لە سێ باس پێکهاتووە:

باسی یەکەم: لێرەدا ئەو ڕاو بۆچوونانەمان باسکردووە کە لەسەر بنەڕەتی ناوی شارەکە هاتووە.

باسی دووەم: لەم باسەدا هەوڵمانداوە بە پشتبەستن بە سەرچاوە مێژووییەکان، لە مێژووی ئەم شارە بەر لە زایینو سەرەتای هاتنی ئایینی ئیسلام بۆ ناوچەکە، تا سەردەمی دەسەڵاتدارانی میرنشینی ئەردەڵان لەو ناوچەیەدا بکۆڵینەوە.

باسی سێیەم: ئەم باسەش تایبەتە بە سەرلەنوێ ئاوەدانکردنەوەی شاری هەڵەبجە لەسەر دەستی بەگزادەکانی شیوەکەڵو دواتریش هاتنی جوولەکەکان بۆ ئەو ناوچەیە، دوای ئەوانیش شەپۆلی نیشتەجێبوونی هۆزی گەورەی جاف لە شارەکەدا، لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە.

بەشی دووەم: ئەم بەشە تایبەتە بە بارودۆخی ئابووریو کۆمەڵایەتیو سیاسیو کارگێڕی هەڵەبجە لە ماوەی دەسەلاتداریتی دەولەتی عوسمانی لەشارەکەدا، ئەم بەشەش لە دوو باس پێکهاتووە:

باسی یەکەم: ئەم باسە تەرخانکراوە بۆ هەلوێستەکردن سەبارەت بە بارودۆخی ئابووریو کۆمەلایەتییەکە لەو قۆناغە مێژووییەی کە دەست نیشانمان کردووە بۆ توێژینەوەکە.

باسی دووەم: لێرەدا بە چڕوپڕی باسمان لە بارودۆخی کارگێڕیو سیاسیی شاری هەڵەبجە کردووە، هەروەها پەیوەندی دەسەلاتدارانی ئەم شارە بەدرێژایی ئەو ماوەیە لەگەلّ هەردوو حکومەتی عوسمانیو ئێرانی، لەگەلّ جێدەستی کاربەدەستانی ئەم شارە لە ئاوەدانکردنەوەی شارەکەدا.

بەشی سێیەم: ئەم بەشە لە پەیوەندی نێوان هەلەبجە بە هەریەکە لە شۆڕشی شێخ مەحمودو دەسەلاتدارانی ئینگلیز لە ناوچەکەدا لە سایەی حوکمی بەریتانیا دەکۆلێتەوە، ئەم بەشەش لە دوو باس پێکهاتووە:

باسی یەکەم: لەم باسەدا لە پەیوەندی نێوان هەلەبجەو شۆڕشە یەك لەدوای یەکەکانی شێخ کۆلراوەتەوە.

باسی دووەم: ئەم باسەش تەرخانکراوە بۆ بارودۆخی شارەکە لە کۆتارۆژەکانی دەسەلاتدارێتی عوسمانی لەو شارەو دواتریش پەیوەندی نێوان کاربەدەستانی هەلەبجەو دەسەلاتدارانی ئینگلیز لەسایەی دەسەلاتی ڕاستەخۆی ئینگلیزەکان لە ناوچەکەدا، وەك ئەوەی لە سەرچاوەکانو یاداشتی کاربەدەستە ئینگلیزەکاندا هاتووە.

ئەو سەرچاوانەش کە بەکارمانهێناون بۆ نووسینی ئەم بابەتە، زیاتر سەرچاوە کوردیو عەرەبیو گۆڤارو ڕۆژنامەکانن، گرنگترینیان (مێجەرسۆن: رحلة متنكر، ئیدمۆندز: کورد تورك عەرەب، ڕەسولّ هاوار: شێخ مەحمودی قارەمانو حکومەتەکەی خوارووی کوردستان، کەریم بەگی فەتاح بەگ: تەئریخی جاف، ئاکۆشوانی: شاری سلێمانی، ئەحمەد خواجە: چیم دی، جەمال بابان: سلێمانی شارە گەشاوەکەم، د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەکر حەمە صدیق عارف: لاپەڕەیەك لە مێژووی هەلەبجە، حەکیمی مەلا سالّح: هەلّەبجە لە ئامێزی مێژوودا)، لەگەلّ چەندین سەرچاوەی جیاجیای تردا.

ئەوە ماوە لێرەدا بیلّێم هەندێ گۆڕانکاری پێویست بەتایبەتی لەڕووی شێوەو ڕوخسارو ڕیزبەندی هەندێ زانیاری بەسەر توێژینەوەکەدا هێنراوە، بۆ ئەوەی شایستەی ئەوە بێت لەشێوەی کتێبێکدا بخرێتەڕوو. لە کاتێکدا هەر ئەم توێژینەوەیە لەڕووی ناوەڕۆکیشەوە گۆڕاوەو لەشوێنی جیاجیا چەندین زانیاری تری بۆ زیادکراوە کە کاتی خۆی لەلایەك لەبەرکەمی ماوە، لەلایەکی ترەوە لەبەر دەستنەکەوتنی هەندێ سەرچاوە کە زانیارییان تێدابوو لەسەر ئەم شارە نەمانتوانی سودیان لێوەربگرین لەکاتی خۆیدا.

جێگای خۆیەتیو بەپێویستی دەزانین لێرەدا زۆر سوپاسی بەرێز (م. ئاکۆ شوانی) مامۆستا لەبەشی مێژووی زانکۆی سلێمانی بکەین، کە ئەرکی سەرپەرشتی کردنی ئەم لێکۆلّینەوەیەی ئێمەی لەئەستۆگرت لەلایەك، لەلایەکی دیکەوە بەردەوام بەڕەخنەو تێبینییەکانی لێکۆلّینەوەکەمانی دەولەمەندترو بەپێزتر دەکرد.

لەکۆتاییدا هیواخوازم بەم ئەرکە زانستییە، توانیبێتم بەشدارییەکی بچووکم کردبێت لەڕوونکردنەوەی بەشێك لەمێژووی هەلّەبجە، لەهەمان کاتدا کەلێنێکی بچووکم لە مێژووی ئەو شارە پڕکردبێتەوەو کۆمەلّێك بابەتی نوێم ورووژاندبێ کە لە نووسینو بابەتەکانی پێشووتردا بەو شێوەیە ئاماژەیان پێنەکراوە، بەهیواشم ئەم لێکۆلّینەوە هەولّێك بێت بۆ لێکۆلینەوەی زیاترو وردتر لەلایەن خەلّکانی دیکەوە لەسەر مێژووی ئەم شارە. ئێمە بەپێ تواناو تا ئەو ڕادەیەی کە بۆمان کرابێت لە کۆکردنەوەی زانیاری سەبارەت بەم بابەتە دریغیمان نەکردووە، هەولّیشمان داوە بە شێوەیەکی زانستی ئەو زانیارییە کۆکراوانە دابڕێژین. دیارە هیچ لێکۆلّینەوەو نوسینێکیش بێ هەلّەو کەموکوڕی نابێت، بێ هەلّەو کەموکوڕیش هەر لە خواوەیە.

## دەروازە

### پێگەی جوگرافی شاری هەڵەبجە

شاری هەڵەبجە، دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی عێراق، لەسەر هێڵی درێژی (46) پلەی ڕۆژهەڵات و نێوان دووبازنەی پانی (35 ـ 36) باکورو (80)کم باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانییەوە[1]، سەبارەت بە تۆپۆگرافیای شارەکە، هەڵەبجە دەکەوێتە گۆشەی باشووری ڕۆژهەڵاتی دەشتی شارەزوورو پێدەشتەکانی شنروێ و باڵامبۆ، هەموو ئەو شاخانەش بە شێوەیەکی نیوە بازنەیی لە دووری (3 ـ 5)کم لە باشوورو خۆرهەڵاتەوە دەوری شاریان داوە، لە دووری (30) کم، ڕیزە چیا سەختو گەردن کەشەکانی هەورامان لە باکوورو باکووری خۆرهەڵاتەوە ئەڕوانن بەسەر دەشتی شارەزوورو شاری هەڵەبجەدا، ئەم تایبەتمەندییە سروشتییانە کاریگەری گەورەیان لەسەر گەشەکردنی شاری هەڵەبجە لەم (150) ساڵەی دواییدا هەبووە.

بەتێکڕا شاری هەڵەبجە بەرزترین بەش لە هەرێمی دەشتی شارەزوور داگیر دەکاتو بەرزاییەکەشی نزیکەی (726)مەترە لە ئاستی ڕووی دەریاوە[2]. تێکڕای بارانی ساڵانە نزیکەی (637) ملم دەبارێت[3]. ئاوو هەواکەشی زیاترلە ئاوو هەوای دەریای سپی ناوەڕاست دەچێت، لە زستاندا ساردو باراناوییە، بەڵام بەهۆی دووری لە دەریاوە، شێدار نییە، هاوینیشی گەرمو وشکە[4]. بەڵام ڕەشەبای هەمیشەیی نییە، تەنیا دوا مانگی پایزنەبێت کە حاڵەتێکی ئاساییەو گەڵای دارو درەخت خەزان دەکاتو ڕوو لە سەرمای زستان دەکات، هەر لە مانگی تشرینی دووەمەوە باران لە هەڵەبجەدا دەبارێ تا مانگی مایسی ساڵی داهاتوو بەردەوام دەبێت، زۆر جاریش مانگی مایسی تەواودەکات[5].

# بەشی یەکەم:

# مێژووی هەڵەبجەو بنەڕەتی ناوەکەی

### باسی یەکەم: ڕەگ و ڕیشەی ناوی هەڵەبجە

ناوی (هەڵەبجە) تا ئێستاش ڕوون نەبووەتەوە لە ڕووی زمانەوانییەوە لە چییەوە هاتووە[6]، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی چەند ڕاو بۆچوونێك سەبارەت بەبنەڕەتی ناوی هەڵەبجە هەیە، لەسەرچاوە مێژووییەکاندا ئاماژە بەهەندێك لەو بۆچوونانە کراوە کە گرنگترینیان ئەمانەن:

---

[1] ـ فەیروز حەسەن: هەڵەبجە نشینگەی جاف و گۆران، گۆڤاری هەڵەبجە، ژمارەی تایبەت، 2002/3/16 ل4.

[2] ـ هەمان سەرچاوە، ل4.

[3] ـ د. سلێمان عەبدوڵڵا ئیسماعیل، تایبەتمەندییەکانی باران لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا، سلێمانی, 2006,ل49 .

[4] ـ ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: شاری سلێمانی (1918 – 1932)، چاپخانەی زانست، سلێمانی، 2002، ل16.

[5] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: لاپەڕەیەك لە مێژووی هەڵەبجە (19700 – 1958)، سلێمانی، 1997، ل18ـ19.

[6] ـ هەمان سەرچاوە، ل6.

**یەکەم:** (هارهار)، هەندێك وای بۆ دەچن کە ناوی هەڵەبجە لە (هارهار)ەوە هاتبێ[1]، بەڵام ئەم بۆچوونە بە دوور دەزانرێ چونکە ناوی (هارهار) هەر زوو گۆڕاوەو کراوە بە (کارشارۆکین)[2]. هەروەك دواتر لێی دەدوێین.

**دووەم:** هەندێکی تر دەڵێن سەرەتا لەلایەن کەسێکەوە بە ناوی (هەڵۆ بەگ)ەوە ئاوەدانکراوەتەوەو ناونراوە (هەڵۆجا)، پاشان وردە وردە ناوەکەی گۆڕاوەو بووە بە (هەڵەبجە)[3]، هەڵۆ بەگ یەکێك بووە لە میرەکانی ئەردەڵان کە لە ساڵانی (1600 – 1615)ز ماوەیەك میرایەتی ئەردەڵانییەکانی کردووە لە (گوڵ عەنبەر)، واتە خورماڵی ئێستا[4].

**سێیەم:** هەندێکی تر دەڵێن لە (هەڵۆژە)وە هاتووە، چونکە هەڵەبجە لە ڕابردوویەکی دووردا باخی هەڵۆژەی زۆری تیابووە، بەڵگەشیان بۆ ئەم بۆچوونە ئەوەیە کە تا ئێستاش گوندنشینەکانی دەوروبەری هەڵەبجە، بە هەڵەبجە دەڵێن (هەڵەوجە) کە لە وشەی (هەڵۆژە)وە نزیکە[5].

**چوارەم:** (ئەلەبجێ) ئەم وشەیە لە دوو بەش پێکهاتووە (ئەڵەب + جێ) واتە (جێگای ئەڵەب). گوتراوە (ئەڵەب) ناوی جوولەکەیەك بووە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی (بێگە بەگی ئەردەڵان)دا هاتووەتە ناوچەکەو یەکەمین ئاوەدانی تێدا دروستکردووە[6].

**پێنجەم:** هەندێکی تر دەڵێن کاتێك خەڵکی ناوچەی کرماشان بۆکاری بازرگانی ڕۆیشتوون بۆ (حەڵەب) لە سووریا بەو ناوچەیەدا تێپەڕبوون، ئەوان کاتێك بینیویانە ئاوو هەوای ئەو ناوچەیە لە ئاوو هەوای (حەڵەب) دەچێت، ئەوان ناویان ناوە (حلبچە)، واتە (حەڵەبی بچووك)[7].

**شەشەم:** (حلە) مێژوونووسان دەڵێن لە پەڕاوە مێژووییەکاندا ناوی (حلە) هاتووە، کە گوندێك بووە لە ناوچەی شارەزووردا (مەئمونی بێگەبەگ) لە سەدەی (10ك)دا حوکمی کردووە. دەڵێن لە بنەچەدا لە دوو بەش پێکهاتووە لە (حلە + بچێ) واتە لە (حلە) ئەچێ، جا بە پێی ڕۆژگار وشەی (چێ) نەماوەو تەنها (حلە) تۆمارکراوە، دەگوترێ کە ئەم شارە هەتا کۆتایی سەدەی یانزەهەمی کۆچی ماوەو پاشان ئاوەدانی تێدا نەماوەو بووەتە گوندێکی بچووكو شوێنەواری پووکاوەتەوە[8]. مەئمون بێگەبەگ خۆشی لەیاداشتەکەیدا ناوی ئەم (حللە)ی بەشێوەی سەنجەقی (حیللە) هێناوە[9].

**حەوتەم:** (عەجەب جێ)، واتە شوێنێکی سەرسوڕهێنەر، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە شوێنێکی ئاوو هەوا خۆش بووەو بەروبوومی زەوی چاکی هەبووە[10].

سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن دوای هاتنی بنەماڵەی (سیانزە ماڵە) بۆ هەڵەبجەو نیشتەجێبوونیان لە نزیك مزگەوتی (تەکیە)ی ئێستا، لەبەرئەوەی شوێنەکەیان زۆر ئاودارو باخێکی زۆری تیابووە، دواتر کاتێك جوولەکەکان دوای ئەمان دێنە

---

[1] ـ جەمال بابان: یا عەبابەیلێ بەرەو ڕووت هاتم    هەڵەبجە خۆشەکەی گوڵی وڵاتم، ڕ (کوردستانی نوێ) ژ (3940)، 2006/4/11.

[2] ـ جەمال بابان: ئەم ناوانە لە چییەوە هاتوون؟، گۆڤاری (زانیاری)، ژ(1)،1970، ل101.

[3] ـ ئەیوب ڕۆستەم: هەگبەو هەوارگە، سلێمانی، 2004، ل37.

[4] ـ هۆشمەند عەتا: سەرچاوەی پێشوو، ل91.

[5] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: لاپەڕەیەك لە، ل6.

[6] ـ حەکیم مەلا ساڵح: هەڵەبجە لە ئامێزی مێژوودا، ب1، چ1، چاپخانەی منارە،2004 ، ل36.

[7] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: لاپەڕەیەك لە، ل6.

[8] ـ هەمان سەرچاوە، ل7.

[9] ـ یاداشتەکانی مەئمون بێگەبەگ, و. سەلاح نەقشبەندی, دەزگای چاپو پەخشی سەردەم, سلێمانی, 2002, ل30 .

[10] ـ حەکیم مەلا ساڵح: سەرچاوەی پێشوو، ل36.

هەڵەبجەو لە نزیك ئەوانەوە نیشتەجێ دەبن، بە شوێنی سیانزە ماڵەکە دەڵێن (عەجەبجێ)یە، واتە (عەجەب جێگەیەکە) لە خۆشیو جوانیدا[1].

(حەسەن فەهمی بەگ)[2] یش، پێی وایە ناوی هەڵەبجە لە (عەجەب جا)وە هاتووە، کە وشەیەکی فارسییە واتای (جێگای سەرسوڕهێنەر) دەگەیەنێت، ناوبراو ئەمەی لە باب‌و باپیرانی خۆیەوە بیستووە[3].

**هەشتەم:** ئەڵەبجە (البجە)، جەمال بابان باس لەوە دەکات کە لە بارەی ئەسڵی ناوی هەڵەبجەوە پرسیاری لە (حامید بەگ)[4] کە یەکێك بووە لە سەرۆکەکانی جاف‌و پیاوێکی گەورەو بەتەمەنی شاری هەڵەبجە بووە کردووە، ئەویش ئەوەی پێگوتووە، کە ناوەکە لە (الب ـ جا)وە هاتووە، (الب ـ الب ئەرسەلان ـ موحەممەدی کوڕی داود) نازناوی سوڵتانی گەورە (وعظ الدولة)یە کە لە نێوان ساڵەکانی (1033 – 1082ز) ناوچەکانی (هەڵەبجەو مەڕوو ئەرفەنیاو هەرات‌و نیساپووری) داگیر کردووە. بەڵگەی (حامید بەگ) شاری (قزڵجەی) ناوچەی (پێنجوێن)ە، بەو مانایەی ئەویش لە (قزڵ ـ جا)وە هاتووە کە بە ناوی (قزڵ ـ ئەرسەلان)ی سەلجوقییەوەیە، (جەمال بابان) پێیوایە ئەم بۆچوونە لە ڕاسییەوە نزیکە[5]،بە بڕوای ئێمەش ئەم بۆچوونە لە ڕاستییەوە نزیکترە لە بۆچوونەکانی تر، بۆ سەلماندانی ئەم بۆچوونەش چەندین بەڵگە هەن، بۆ نموونە:

1ـ عەلی ئەکبەر خانی سنجابی لەسەرەتای ساڵی (1918)دا هاتووەتە هەڵەبجەو ماوەی (18) ڕۆژ لەماڵی (عادیلە خان)دا ماوەتەوە، ناوبراو لەزۆر شوێن‌و جێگای بیرەوەرییەکانیدا سەبارەت بەو ڕۆژانەی کە لەهەڵەبجە بووە ناوی هەڵەبجەی بە شێوەی (البجە) هێناوە[6].

2ـ لە ناساندنی قوتابییەکانی مەلا عەبدوڵڵای خەرپانیدا ناوی یەکێکیان براوە بە شێوەی (مەلا ئەحمەد ئەلەبجەیی)[7].

3ـ کتێبی (اسناد و مکاتبات تاریخی ایران قاجاریە)، کە گەلێك بەڵگەنامەی لەسەر کورد تیایە، بەڵگەنامەکان یەکێکیان نامەی (عەبدوڵڵا بەگ)ی فەرمانڕەوای سلێمانییە، کە بۆ (کامیل پاشا)ی والی ئەرزڕوومی ناردووە هاتووە: (لشکراورامان را فرستادە محالین گلعنبر و البجە را چپگ و تصرف نمودە) واتە (لەشکری هەورامانمان ناردو هەردوو مەڵبەندی گوڵعەنبەرو ئەڵەبجەیان گرت‌و ڕێککخست)[8].

---

[1] ـ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (خوشکانی حەمە فەرەج) لە ڕێکەوتی 2007/2/8، هەڵەبجە.

[2] ـ کوڕی عەلی بەگی مەحمود پاشایە، لە سەرۆکەکانی جافە، لە 1905/11/16 لە هەڵەبجە لەدایك بووە، لە 1973/6/18 لە بەغداد کۆچی دوایی کردووە، لەسەردەستی مامۆستای تایبەت خوێندوویەتی، ئارەزووی بەلای ئەدەبدا ڕۆیشتووە، چەندین بەرهەمی هەیە، (میر بەسری: ناودارانی کورد، و. عەبدولخالق عەلادینی، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، 2002، ل223).

[3] ـ جەمال بابان: ئەم ناوانە، گۆڤاری (زانیاری)، ژ(1)، ل102.

[4] ـ کوڕی مەجید بەگی کوڕی عوسمان پاشای کوڕی موحەممەد پاشایە، یەکێکە لە سەرۆك عەشیرەتە ناودارەکانی جاف، لە شاری هەڵەبجە لەدایك بووە لە ساڵی 1889ز، هەر لەوێش خوێندنی ئایینی لەسەر دەستی مامۆستا ناودارەکانی شاری هەڵەبجە خوێندووە. دەسەڵاتدارانی ئینگلیز لە سەردەمی داگیرکاریدا کردوویانە بە جێگری قائیمقامی هەڵەبجە، پاشان لە سەردەمی حکومەتی نیشتمانیدا بووە بە قائیمقامی هەڵەبجە لە (1925 – 1932)، لە ساڵی 1933 گوازراوەتەوە بۆ قائیمقامی چەمچەماڵ، لە خولەکانی (حەوت‌و یانزەو دوانزەو سیانزەو پانزە)دا ئەندامی پەرلەمانی عێراق بووە. (جەمال بابان: اعلام کرد العراق، مطبعة (شفان)، سلیمانیة، ل226).

[5] ـ یا عەبابەیلێ، ڕ (کوردستانی نوێ)، ژ (3940)، 2006/4/11.

[6] ـ د. کریم سنجابی: ایل سنجابی‌و مجاهدت ملی ایران، تەهران، 1380 شەمسی، ل531ـ544.

[7] ـ بەوەرگرتن لە: حەکیم مەلا ساڵح: سەرچاوەی پێشوو، ل37.

[8] ـ هەمان سەرچاوە، ل37ـ38.

4ـ لەزۆرێك لەو بابەتو نووسینانەی کە لە ڕۆژنامەکانی (پێشکەوتن، بانگی کوردستانو ئومێدی ئیستیقلال)و باقی ڕۆژنامەکانی دیکەی بیستەکانی سەدەی بیستدا سەبارەت بەهەڵەبجەو بارودۆخی هەڵەبجە نوسراوە، ناوی (هەڵەبجە)یان بە شێوەی (البجە) هێناوەو نووسیوە [1].

سەبارەت بە گۆڕینی ناوی (هەڵەبجە)، لە شێوە نووسینی (البجە)وە بۆ (هەڵەبجە)، ئەوە شتێکی ئاساییەو لە زمانی کوردیدا بەتایبەتی شێوەزاری (جاف)ی، (ئەلف) دەگۆڕێت بە (هـێ) وەك: (ئومێد ـ هومێد، ئەستێرە ـ هەسارە، ئەوڵ ـ هەوەڵ... هتد) [2].

## باسی دووەم: مێژووی هەڵە بجە وەك لە سەرچاوە کۆنەکاندا هاتووە

هەڵەبجە شارێکی دێرینی کوردستانە [3]، مێژوویەکی کۆنی هەیە، دەگەڕێتەوە بۆ چەرخی بەر لە مێژوو، بەپێی ئەو ئامێرو کەلوپەلو کاسەو کەوێڵو گۆزەگەرییەی کە لە ناوچەکەدا هەبووەو دۆزراوەتەوە. وێڕای گردی (بەکراوە)و شوێنەواری شوراکەی [4].

مێژووی کۆن لە نزیك جێگای ئێستای شاری هەڵەبجە باسی شاری (هارهار ـ کارشارۆکین) دەکات کە ناوەندێکی گرنگ بووە [5].

(د. حوسامەدین نەقشبەندی)ش، کاتێك ئاماژە بە هەندێك لە شارەکانی وڵاتی لۆلۆییەکان دەکات دەڵێت: "سەرچاوە کۆنەکان ئاماژە بە بوونی شارێ بە ناوی (هارهار ـ کارۆکین) دەکەن لە نزیك جێگای هەڵەبجەی ئێستا، کە ناوەندێك بووە لە ناوەندە گرنگەکانی وڵاتی لۆلۆییەکان" [6].

سارگۆنی ئەکەدی لەسەدەی (28ی پ. ز)دا هێرشی کردە سەر شاری (هارهار)و داگیری کرد، پاشان ناوەکەی گۆڕاو کردی بە (کارشارۆکین) کە بە مانای شاری (سارگۆن) دێت [7].

ئاشوورییەکانیش لە ساڵی (829ی پ. ز)دا بە هێزێکی گەورەوە هێرشیان کردە سەر شارەزوورو هەڵەبجەو ناوچەکە، کە ئەوکات بە (کارخی) بەناوبانگ بووە، شارو گوندی ناوچەکەیان سووتاندووەو کاولکردووە، ناوچەکەشیان خستۆتە سەر وڵاتی خۆیان.

بە هەمان شێوە (سارگۆنی دووەم)ی ئاشووریش (722 ـ 705پ. ز) کاتێك هەوڵی فراوانکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی لەلایەکو دابینکردنی ئاسایشی هەرێمەکەی دەدا لەلایەکی ترەوە وەك کوردستانو مانائیو خاکی مادەکان، شاری (کارشارۆکین ـ Karsharrukin) کە هەمان شاری (هارهار) بووە، کردوویەتی بە ناوەندی مەڵبەندێك کە لە کرماشانەوە تاوەکو هەمەدانی لەخۆگرتووە، هێزێکی زۆریشی بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کردووە [8].

---

[1] ـ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ژمارەکانی ڕۆژنامەکانی پێشکەوتن، ژ (22، 29، 46، 62)، و بانگی کوردستان، ژ (3)... هتد.
[2] ـ حەکیم مەلا ساڵح: سەرچاوەی پێشوو، ل38.
[3] ـ شێخ عەلی: چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی هەڵەبجە، گۆڤاری (هەڵە بجە)، ژمارەی تایبەت، 2002/3/16، ل9.
[4] ـ کەریم زەند: جوگرافیای کوردستان، چ2، سلێمانی، 2005، ل226.
[5] ـ محەمەد ئەمین زەکی: تاریخی سلێمانی وە وڵاتی، ب3، چ2، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، 2006، ل15.
[6] ـ المدن القديمة المندرسة في محافظة السليمانية وتعيينية مواقعها، گۆڤاری (کاروان)، ژمارە (34)، 1985، ص151.
[7] ـ محەمەد ئەمین زەکی: خولاصەی تەئریخی کوردو کوردستان، ج2، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، 2004، پ11، ل69.
8 ـ حەبیبوڵڵای تابانی: هاونەتەوەیی قەومی کوردو ماد، و. جەلیل گادانی، ب1، چاپخانەی (تیشك)، 2004، ل160.

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکی تر لە سەرچاوە مێژووییەکان مێژووی ئەو شارە بۆ سەردەمێکی کۆنتر دەگێڕنەوە کە سەردەمی (سۆمەرییەکان)ە لە هەزارەی پێنجەمی پ. ز [1].

(ع.ع. شەونم)، باس لەوە دەکات کە لە سەردەمی منداڵی خۆیدا لە ماڵی خۆیاندا توورەکەیەك پارەی (مس)یان دۆزیوەتەوە کە مێژووەکەی بۆ سەردەمانێکی زۆر کۆن گەڕاوەتەوە، دواتر برا گەورەکەی بەو پارەیە لەشکری لە منداڵان پێدروست کردووە، مانگانە پارەی بۆ بڕیونەتەوە لەو پارە (مس)ە، هەتاوەکو پارەکە تەواو بووە، دواتر کەسێك هاتووەتە لای باوکی ئەوەی پێوتووە کە ئەو پارانە کۆبکاتەوە، چونکە ئەوە موقەددەراتی میللەتێکەو دەبێت بدرێت بە حکومەت، چونکە ئەوە شوێنەوارەو موڵکی میللەتێکە [2].

ئەوەی زیاتر مێژووی کۆنی ئەم شارە دەسەلمێنێ، تەنها لە گەڕەکی (پیر موحەممەد) کە یەکێکە لە گەڕەکە هەرە کۆنەکانی شار، دووجار مردووی تێدا دۆزراوەتەوە کە لە کوپەی گەورەدا نێژراون، یەکێك لەو مردووانە لەناو کوپەیەکی گەورەدا بووە کەتەنها ئێسقانەکانی ماوە، قەڵغانێكو شمشێرێکی لەگەڵدا بووە، لەگەڵ کوپەیەکی لەو بچووکتر کە لە تەنیشتیەوە دانراوە، بەڵام هیچ نووسینێکیان لەسەر نەبووە تا مێژووەکەی پێ دیاری بکرێت [3].

موحەممەد ئەمین زەکی بەگ دەڵێت: "لە پێش ئیسلامدا لە شوێنی شاری هەڵەبجەی ئێستادا شارێکی گەورەو ئاوەدان هەبووە، کە پردی بازرگانیو کاروانی کاڵاو شمەکی شارە کۆنەکانی ئێرانو شاری تەیسەفوون (تاقی کیسرا) بووە، بەڵام ناوی هەڵەبجە نەبووە" [4].

لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلامو هاتنی سوپای موسڵمانان بۆ فەتحکردنی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ساسانیو بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام لەو ناوچەیە دیارە شاری هەڵەبجە هەبووە، کوژرانی سەرکردەیەکی وەکو (ئەبا عوبەیدەی ئەنساری)و ناشتنی لە ناوچەکەدا (گوندی عەبابەیلیێ) [5]، بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو کاتە هەڵەبجەو شارەزوور ئاوەدان بووە [6].

لە سەرویەندی هاتنی مەغۆلەکانو دەسەڵاتی جەنگیزخانی مەغۆلی لە ناوچەکەو ئێراندا، (بابا ئەردەڵان) کە دامەزرێنەری میرنشینی ئەردەڵانو یەکەم میری ئەو میرنشینەیە دەستی بەسەر شارەزووردا گرتووەو میرایەتی تێدا دامەزراندووە، دوای (بابا ئەردەڵان) کلۆڵی کوڕی دەسەڵات دەگرێتە دەست، دوابەدوای ئەویش (مەئمون بەگی کوڕی کلۆڵ) بۆ ماوەیەکی زۆر فەرمانڕەوایەتی شارەزووری کردووە، (مەئمون) لە سەردەمی دەسەڵاتدارێتی خۆیدا ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی لە نێوان کوڕەکانی خۆیدا دابەشکردووە، (بێگە بەگ)ی کوڕی ناوچەکانی (زەلم [7]، تەغەسوو (نەوسوو)،

---

1ـ تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان بەرنامەیەکی تایبەت بە هەڵەبجە، عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، 16ـ2006/3/17.

2 ـ هەمان سەرچاوە.

3 ـ هەمان سەرچاوە.

4 ـ وەرگیراوە لە: حەکیم مەلا ساڵح: سەرچاوەی پێشوو، ل38.

5 ـ ئەم گوندە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شاری هەڵەبجە بە دووری (3کم)، پێشتر ئەم گوندە ناوی سازگار بووە، دوای هاتنی سوپای ئیسلامو کوژرانی (ئەبو عوبەیدەی ئەنساری) لەوێدا، دواتریش ناشتنی هەر لەو گوندەدا، وردە وردە ناوەکە گۆڕاوە بۆ (ئەبا عوبەیدە) پاشتر بە هۆی گۆڕانی زمانەوانییەوە گۆڕاوە بە (عەبابەیلی). (توێژەر)

6 ـ شێخ عەلی: سەرچاوەی پێشوو، ل11.

7 ـ دەکەوێتە دووری (9کم) لە ڕۆژهەڵاتی ناحیەی خورماڵەوە (گوڵعەنبەر). (میر شەرەفخانی بەدلیسی: شەرەفنامە،و. هەژار، چ3، پ2، چاپو بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر،2006، ل134).

شەمێران[1]، هاوار[2]، سیمان[3]، ڕاودانیو گوڵعەنبەر)ی بەرکەوتووە، (بێگە بەگ) بۆ ماوەی (42)ساڵ فەرمانڕەوایی ئەم ناوچانەی کردووە.

لە دوای (بێگەبەگ)، (مەئمون بەگ)ی کوڕی دەسەڵات وەردەگرێت لە میرنشینی ئەردەڵاندا، بە هەمان شێوە ئەمیش فەرمانڕەوایی ناوچەی شارەزووری کردووە، یەکێك لەو ناوچانەی کە لەژێر دەسەڵاتو قەڵەمڕەوی (مەئمون بەگ)دا بوو مەڵبەندی (حیللە)[4] بووە لە ساڵی (1005ك/1596ز)دا[5]، ئەم میرە بۆ ماوەیەکی زۆر وەك (شەرەفخان) باسی لێوە دەکات بە خۆشگوزەرانیو بەبێ ترسو نیگەرانی فەرمانڕەوایەتی ئەو شارەی کردووە، سەنجەقی (سرۆچك)[6] یش لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە دراوە بە (ئیسماعیل)ی برای، کە فەرمانڕەوایی تیادا بکات، ئەویش تاوەکو مردن ناوچەکەی بەڕێوەبردووە[7].

## باسی سێیەم: مێژووی نوێی هەڵەبجەو ئاوەدانکردنەوەی

گومان لەوەدا نییە کە هەڵەبجەی ئێستا لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی عوسمانیەکاندا بنیادنراوەتەوە[8]، چونکە هەڵەبجە مەڵبەندی فەرمانڕەوایی بووە لە سەردەمی عوسمانیەکاندا، لەکۆتایی دەشتی شارەزووردا[9]، بەڵام کەیو کێ سەرلەنوێ بنیادی ناوەتەوە؟ ئەوە پرسیارێکەو وەڵامەکەی ڕاو بۆچوونی جیاوازی دروست کردووە[10].

شاری هەڵەبجە، کە یەکێکە لە شارە کۆنەکانی کوردستان، سەرەتای ئاوەدانکردنەوەی دەگەڕێتەوە بۆ چەند سەدەیەك لەمەوپێش[11]، هەندێ لە سەرچاوە مێژووییەکان باس لەوە دەکەن کە ئەوانەی ئەم شارەیان ئاوەدانکردەوە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە هاتوون، لە ئەنجامی شەڕو شۆڕو برسێتی هاتوون بەمدیوداو لەوشوێنەی کەپێی دەڵێن (هەڵەبجە) نیشتەجێبوون[12]، بۆچوونێکی تر هەیە کە دەڵێت ئەمانە لە ناوچەی شارباژێرەوە هاتوون، نەك لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە کە پێشتر ئاماژەمان بۆکرد[13]، کە بەبڕوای ئێمەش ئەم بۆچوونەیان زیاترلە ڕاستیەوە نزیکترە، ئەم خەڵکانە

---

[1] ـ ناوچەیەکە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای شاری هەڵەبجەوە، ئێستاش شوێنەواری قەڵاکەی ماوە. (میرشەرەفخانی بەدلیسی: سەرچاوەی پێشوو، پ2، ل135).

[2] ـ دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شاری هەڵەبجە، یەکێکە لە گوندەکانی هاوارییەکان، پەیڕەوی ئایینی کاکەیی دەکەن.

[3] ـ مەلا جەمیل دەڵێت: ڕەنگە شێخان بێ لە نزیك نەوسوودو گۆڕی پیرۆزی سوڵتان ئیسحاقی پیری کاکەیی لێیە. (هەمان سەرچاوە، پ2، ل135).

[4] ـ مەلا جەمیل دەڵێت: ( بێگومان ئەوە ئەو شاری (حللە) نییە کە لە نزیك بەغداد دایە، (ئیبنو بەتوتە) دەڵێت: بینیومەو نیوەی دانیشتوانی کوردن، چونکە (حیللە)و (سرۆچك) هیچ پەیوەندییان بەسەر یەکەوە نییەو دووریش نییە ئەوە هەڵەبجە بێو ناوی گۆڕابێ، ئەو دەمەش سەر بە لیوای بەغداد بووبێ. (میر شەرەفخانی بەدلیسی: شەرەفنامە، و. هەژار، چ3،، دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی ئاراس ـ هەولێر، پ1، ل136).

[5] ـ میر شەرەفخانی بەدلیسی: شەرەفنامە، و. هەژار، چ3،، دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی ئاراس ـ هەولێر،، 2006، ل135 – 136.

[6] ـ سرۆچك مەبەستی بەرزنجەیە، کە پێشتر بە ناوی سرۆچك ناوی ڕۆشتووە لە سەرچاوە مێژووییە کۆنەکاندا. ( میر شەرەفخانی بەدلیسی: سەرچاوەی پێشوو، ل52).

[7] ـ هەمان سەرچاوە, ل135 – 136.

[8] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: لاپەڕەیەك لە، ل7.

[9] ـ کەریم زەند: سەرچاوەی پێشوو، ل226.

[10] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: لاپەڕەیەك لە، ل7.

[11] ـ گۆران هەڵەبجەیی: هەڵەبجەو کارەسات، گۆڤاری (پەیڤ)، ژ (10و 11)، 1989، ل1036.

[12] ـ هەمان سەرچاوە، ل1036.

[13] ـ چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (حاجی تۆفیق)، 2007/2/9، هەڵەبجە.

لەناو خەڵکو شاری هەڵەبجەدا بە بنەماڵەی( سیانزەماڵە) ناسراون، ئەمانە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆش بنەچەیان ماوەو پێیان دەڵێن بنەماڵەی (سیانزە ماڵەکە) [1].

پێشتر شوێنی شاری هەڵەبجە ئاوەدانی تێدا بووە، پاشان بە هەر هۆکارێك بووبێت ئەو ئاوەدانییەی تێدا نەماوە، بەڵام هەڵەبجەی ئێستا سەرەتا لەلایەن (شۆڕەبەگ)ەوە کە لە بەگزادەکانی (شیوەکەڵ) بووە لە ساڵەکانی (1650ـ1700ز) سەرلەنوێ ئاوەدان کراوەتەوە، پاش ئەوەی لەگەڵ ژمارەیەك لە کەسوکاریدا بۆ یەکەمجار لەو شوێنەی کە پێیدەوترێت کانی (هەشت هەڵوژە) وەك کۆچەر هەڵیانداوە. دواتر لە دەوروبەری مزگەوتی (تەکیە) [2]ی ئێستادا خانوویان دروستکردووە، پاشان چەند ماڵێکی جوولەکەش لە خورماڵەوە هاتوونو لە نزیك ئەوانەوە نیشتەجێبوون، بەپێی ئەم بۆچوونەش کۆنترین خانووەکانی هەڵەبجە لە دەورو پشتی مزگەوتی (تەکیە) دروستکراون [3].

(حەمەچاوش) سێ کوڕی بە ناوەکانی (پیرۆت، سلێمان، عەبدوڵلا) هەبووە، سلێمان چوار کوڕی هەبووە بە ناوەکانی (ئەمین، موحەممەد، قادر، فەرەج)، عەبدوڵلاش شەش کوڕی هەبووە بە ناوەکانی (حەمە ساڵح، عەبدوڕڕەحمان، ئەحمەد، مەحمود، سەعید، ئەمین)، پیرۆتیش هەر بە لاوی مردووە. دواتر ئەم سیانزە ماڵە لە دەوروبەری مزگەوتی تەکیەدا نیشتەجێ بوون، بۆ خواردنەوەو کشتوکاڵ سوودیان لە سەرچاوەکانی کانی (نەواڵە) وەرگرتووە، کە ئەو سەردەم سەراوێکی گەورە بووە، لە ئێستادا ئەو کانییە دەکەوێتە ناو (باخی گشتی) ناوەڕاستی شارەوە، ئەمە جگە لەوەی کە لە جێگەی مزگەوتدا کانییەك هەبووە [4]. بەپێی ئەم بۆچوونەش یەکەمین بنەماڵەیەك شاری هەڵەبجەی سەرلەنوێ ئاوەدانکردووەتەوە، ئەو ماڵانەن کە لەئێستادا لەناو خەڵکی شاردا بە (سیانزە ماڵە) ناسراون [5].

زۆربەی سەرچاوەکان لەسەر ئەوە کۆکن هاوکات لەگەڵ دەستپێکردنی نیشتەجێبوونی (جافەکانی ئێلی مورادی) [6]، پاش وەرگرتنی ڕەزامەندی پاشای جاف (حەمە پاشا)، ئیتر وردە وردە هەڵەبجە زیاتر ڕووی لە ئاوەدانی کردووە، لەبەر ئەوەی شوێنەکەی شینایی‌و ئاودار بووە، ساڵ لە دوای ساڵ خەڵکی زیاتر ڕوویان لە شارەکە کردووە بۆ نیشتەجێبوون [7].

هەرچەندە یەکڕابوونێك هەیە لەوەدا کە هەڵەبجە لە دوای ساڵی (1700ز)یەوە دروستکراوە [8]، هەندێکی تر لە سەرچاوە مێژووییەکان سەرەتای بنیاتنانی هەڵەبجە دەگەڕێننەوە بۆ ساڵی (1850 – 1860) لە سەردەمی دەسەڵاتی

---

[1] ـ گۆران هەڵەبجەیی: سەرچاوەی پێشوو، ل1036.

[2] ـ لە ڕووی مێژووییەوە بە کۆنترین مزگەوتی شاری هەڵە بجە دادەنرێت، دوای ئاوەدانکردنەوەی شارەکە.

[3] ـ ئەیوب ڕۆستەم: هەگبەو هەوارگە، ل35ـ36.

[4] ـ حەکیم مەلا ساڵح: سەرچاوەی پێشوو، ل11.

[5] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: لاپەڕەیەك لە، ل10.

[6] ـ عەشیرەتی جاف، یەکێکە لە هۆزە گەورەو ناودارەکانی نەتەوەی کورد، لە بنەڕەتدا هۆزی جاف لە خوارووی ڕۆژهەڵاتی هەڵەبجەوە لە ناوچەیەك لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانەوە کە پێی دەوترێت (جوانڕۆ) نیشتەجێ بوویوون، لەو شوێنەدا بە شێوەیەکی سەربەخۆ دەژیان، ناوچەکەیان ناوچەیەکی گرنگو گەورە بوو لە ناوچەی میرنشینی ئەردەڵاندا، بەگزادەکانی جاف تا ساڵی (1718ز)یش هەر خاوەنی ئەم دەسەڵاتە بوون بەسەر ناوچەو هێزەکانی خۆیاندا، بەناو لەسایەی فەرمانڕەوایەتی میرەکانی ئەردەڵاندا بوون. ئەم سەربەخۆیی‌و مل نەدانەیان بۆ دەسەڵاتی ئەردەڵانیەکان بوو بە هۆی ناکۆکی‌و دوژمنایەتی, لەئەنجامدا جەنگێکی ناهەموار لەنێوانیاندا هەڵگیرسا, ئەردەڵانیەکان توانیان هێزێکی چاك کۆبکەنەوەو هێرش بکەنە سەر جافەکان, لەئەنجامی ئەم جەنگەدا سەرۆکی جافەکان کوژرا, دواتر کوڕو براکەشیان گرتو بەخنکاندن کوشتنیان. ئەم ڕووداوە بووە هۆی کۆچکردنو ڕەوکردنی ژمارەیەکی زۆر لە سەرۆكو خێزانەکانی هۆزی جاف لە ناوچەی (جوانڕۆ)، پەنایان برد بۆ لای میرەکانی (بابان) لە قەڵاچۆلان. دەرکەوتنی هۆزی جاف لە شارەزووردا دەستپێدەکا لە کاتی هەڵاتنو کۆچکردنی (زاهیر بەگ)و زیاتر لە (100) ڕەشماڵی جاف لە ناوچەی (جوانڕۆ)وە بۆ ناوچەی (بانی خێڵان) کە ئەکەوێتە قەراغی ڕۆژئاوای ڕوباری سیروان، ئەمەش لە سەردەمی (ئەحمەد پاشا)ی باباندا بووە لە قەڵاچۆلان. (مەحمود عەزیز حەسەن: مێژووی هۆزی جافو باسی هەندێك لە تیرەکانی، چاپخانەی نەورەس، سلێمانی، 1985، ل11).

[7] ـ ئەیوب ڕۆستەم: سەرچاوەی پێشوو، ل36.

عوسمانییەکاندا[1]، بەڵام ئەم بۆچوونە کەمتر لە ڕاستییەوە نزیکە، چونکە (ریچ) لە ساڵی (1820ز)دا باسی هەڵەبجە دەکاتو وەکو شار ناوی دەهێنێت، کە کەوتووەتە کۆتایی دەشتی شارەزوورو باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری سلێمانییەوە[2].

سەرهەڵدانی هەڵەبجە وەکو شارۆچکەیەك، دواتریش گەشەکردنی بۆ شارێك، پەیوەستە بە مێژووی هۆزی جافەوە، هۆزی جاف هەمیشە هێزێك بوو لەم سێ سەدەی دواییدا لەلایەنی هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو ئێرانی (سەفەوی و قاجار) حسابی بۆ دەکرا[3].

هەروەك پێشتر باسکرا دوای نیشتەجێبوونی (13) ماڵە، نزیکەی (20) ماڵە جوولەکەی بۆ هاتووە کە بە تەنیشتی ئەوانەوە خانوویان دروستکردووە، پاشان لە سەردەمی دەسەڵاتی (حەمە پاشای جاف)دا ژمارەیەك ماڵە بەگزادەی جاف تێهاتووە، لەوشوێنەی کە ئێستا پێی دەوترێت (گەڕەکی پاشا) ڕەشماڵیان هەڵداوەو چەند خانوویەکیشیان دروستکردووە، دوای ئەمانیش لە سەردەمی (مەلا عەبدوڵڵای خەرپانی)دا گەڕەکی (پیر موحەممەد) کە ناوەندەکەی مزگەوتی (جامیعە)بووە ئاوەدانکراوەتەوە. دواتر وردە وردە خەڵك ڕووی تێدەکەنو ڕوو لە گەورەبوون دەکات[4]، تا وایلێهات دوکانو بازاڕ لە نزیك ماڵەکانەوە دروستکران[5].

کەریم بەگی فەتاح بەگ دەڵێت: "پێنجوێنو ئەڵەبجە، کە ئێستا دوو قەصەبەن، لە پێش محەممەد پاشادا دوو دێی بچووك بوون، ئەو کردنی بە شار، قەیسەریو حەمامو چایخانەی تێدا دروستکردو بوون بە شار، خانوویەکی زۆر گەورەشی لەسەر گردی (بەکراوا) هەبوو، بەواسیتەی ئەمە کە خاکی شارەزوور کەم دەوامە زۆر دەوامی نەکرد، دوو مزگەوتیشی هەیە، یەکێ لە ئەڵەبجەو یەکێ لە پێنجوێن، مزگەوتی ئەڵەبجەی ئێستەش دەوام ئەکاو ئەساسی تاپۆی ئەراضی و ئاو ئەو بۆ بەگزادەی داناوە"[6].

---

[1] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: لاپەڕەیەك لە، ل7.

[2] ـ شەیدا محەمەد ئەمین: هەڵەبجەو چرکەساتەکانی کیمیاباران، گۆڤاری هەشتاو هەشت، ژ (5و6)، 2006، ل24.

[3] ـ کلۆدیۆس جیمس ریچ: گەشتی ریچ بۆ کوردستان 1820، و. محەمەد حەمە باقی، تەبرێز، ئێران، 1992، ل124 – 125.

[4] ـ فەیروز حەسەن: سەرچاوەی پێشوو، ل1.

[5] ـ حەکیم مەلا ساڵح: سەرچاوەی پێشوو، 11 – 12.

[6] ـ چنور فایەق تۆفیق: کارەساتی کیمیابارانی هەڵە بجە، گۆڤاری هەشتاو هەشت، ژ (5و6)، 2006، ل55.

[7] ـ تەئریخی جاف، لێکۆڵینەوەی د. حەسەن جاف، بەغدا، 1995، ل185ـ 186.

# بەشی دووەم:

# بارودۆخی ئابووریو کۆمەڵایەتیو سیاسیو کارگێڕی هەڵەبجە لە ماوەی دەسەڵاتدارێتی عوسمانیدا

## باسی یەکەم: بارودۆخی ئابووریو کۆمەڵایەتی

شاری هەڵەبجە، هەر لە سەرەتای دروستبوونییەوە هەمیشە لەبەر گەلێ هۆکار ئاوەدان بووە، بەردەوام ڕوو لە پێشکەوتن بووە، ڕوویەکی شارستانی وەرگرتووە، بەردەوام لە گۆڕانو جموجووڵو تێکەڵاویدا بووە، ئەمەش کاری کردۆتە سەر خەڵکی شارەکەو هەڵسوکەوتو خووڕەوشتیان[1] . ئەم تێکەڵاویو پەیوەندیو هاتوچۆکردنە کاری کردە سەر لایەنی کۆمەڵایەتی خەڵکی شارەکەو دیمەنێکی پێشکەوتوو شارستانی پێبەخشی بوو. ئەمەش جۆرە سەربەستیو کراوەییەکی لە نێوان خەڵكو ئەندامانی خێزانەکاندا بلاوکردبووەوە، جگە لەکردنەوەی مزگەوتو بوونی مەڵبەندی ئایینیو خوێندنگا کە بەرگێکی ڕۆشنبیری بەشارەکە بەخشیبوو، ئەمانەش تێکڕا ڕۆڵی تایبەتییان بینیوە لەجۆری پەیوەندی ڕۆژانەی خەڵکدا.[2]

ڕەنگە نەتوانرێت بەجیا باس لە هەریەکە لە لایەنەکانی (کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری، ئایینی، ئەدەبی) شارەکە بکرێت، چونکە ئەمانە بە شێوازی جۆراوجۆر کاریگەرییان لەسەر یەك هەبووەو تێکەڵکێشی یەکتربوون، بە هەموویانەوە باسێکی تێروتەسەل بۆ هەڵەبجەو ناوچەکە پێکدەهێنن .[3]

شاری هەڵەبجە، لەو سەردەمەدا مەڵبەندی جافەکان بووە، نزیکەی تەواوی خەڵکی ئەم قەزایە، هەروەك (ئیدمۆندز)[4] ئاماژەی بۆ کردووە (تاپۆی) بنەماڵەی حاکمەکان بووە، جافەکان بەلایەنی کەمەوە سێ لەسەر چواری ڕێژەی دانیشتوانی ئەم قەزایەیان پێکدەهێنا. جافەکان پێیان وتراوە کوردی ڕەسەنو گرنگترین هۆزی باشووری کوردستان بوون[5] . ئەم هۆزە

---

[1] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: ئەحمەد موختار بەگی جاف (شاعیرو مرۆڤ)، سلێمانی، 2000، ل103.

[2] ـ هەمان سەرچاوە، ل104.

[3] ـ پارێزگای سلێمانی: سالنامەی سلێمانی، 1999، ل163.

[4] ـ لەبەشەکانی داهاتوودا ناوی ئیدمۆندز زۆر دوبارە دەبێتەوە، چونکە خۆی یەکێك بووە لەوانەی لەنێو ڕووداوەکاندا ژیاوە، بەتایبەت ڕووداو و کاروبارەکانی سەر بە هەڵەبجە، بۆیە بەپێویستی دەزانین کورتەیەك دەربارەی ژیانی بخەینە ڕوو, (سیسل جوون ئیدمۆندس) لە ساڵی 1889ز لەدایك بووە, کۆلێجی (کمبرج)ی تەواوکردووە, لە ساڵی (1910) دا قوتابییەکی وەرگێڕ بووە لە قونسلی گشتی بەریتانیا- لە کەناری ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاست، لە ساڵی (1913)دا بوو بە وەکیلی یاریدەدەری قونسولی گشتی بەریتانیا لە (بوشەهر) و ساڵی 1915بوویە یاریدەدەری ئەفسەری سیاسی هێزەکانی بەریتانیا لەباشوری ڕۆژئاوای ئێران, دواتر لەساڵی 1919 لە باکوری ڕۆژئاوای ئێران بەهەمان پلە , لەساڵی 1922 ئەرکێکی تایبەتی لە باشوری کوردستاندا پێ سپێردراوە, ماوەیەك یاریدەدەری حاکمی سیاسی هەڵەبجە بوو, دواتر لەڕاوێژکاری بەشەوە بوو بە پشکنەری بەڕێوەبەرایەتی لە حکومەتی عێراقدا و پەیوەندیدار بەهێزە سەربازیەکانی بەریتانیای ناوچەی کەرکوكو سلێمانی، لەساڵی 1924 دا. لەساڵی 1925 ئەرکی ئەفسەری پەیوەندی لەلیژنەی نێودەولەتی لەکێشەی موسل پێ سپێردراوە, لە ساڵی 1926 بوو بە یاریدەدەری ڕاویژکاری ناوخۆیی عێراقو لەساڵی 1928 بوو بە قونسولو لە ماوەی ساڵانی 1925ـ1945 ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوخۆی عێراق بووە, لە حکومەتی عێراق وازی لەخزمەتگوزاری هێنا دوای ئەوەی لەساڵی 1938 دا نیشانەی ( ڕافیدین)ی پێبەخشرا لەلایەن حکومەتەکەی خۆیەوە, لەساڵی 1948 بەپلەی وەزیر لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا دامەزرا تا لە ساڵی 1950 خانەنشین کرا, خاوەنی کتێبە بەناوبانگەکەی ( کورد تورك عەرەب)ە. ( عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: ئەحمەد موختاربەگی جاف, سلێمانی, 2000, پ3, ل225ـ226 )

[5] ـ س. ج، ئیدمۆنس: کورد تورك عەرەب، و. حامید گەوهەری، چ2، دەزگای چاپو بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، 2004، ل182.

هۆزە لە پەیڕەوانی ئایینی ئیسلامو لەسەر ئاینزای (سوننی شافیعی مەزهەب) بوون، دابو نەریتی ئایینیان [illegible] دیاردەی ناوچەیی تێکەڵ بووبوو[1].

دوو تیرەی گرنگی جاف، کە لەو سەردەمەدا بە تەواوی لە گوندەکانیان نیشتەجێ بووبوون، تیرەکانی (نەورۆڵیو یەزدان بەخشی)[2] یەکان بوون، نەورۆڵی تیرەی (دەشتو پرچە)، لەو سەردەمەدا لە (600) خێزان پێکهاتبوونو لە (16) گوندی نزیك هەڵەبجەدا دەژیان. (یەزدان بەخشی)یەکانیش (8) گوندیان لە سێ کوچکەی شەمێراندا هەبووە. ئەم دوو تیرەیە لە بنەڕەتدا لە (موڕادییەکان) خێڵنشین بوون[3].

بەپێی ئەو سەرژمێرییەی کە ئینگلیزەکان لە دەوروبەری ساڵی (1920)دا لە شاری سلێمانیو قەزاو ناحیەکانی سەر بەو شارە پێی هەستاونو ئەنجامیانداوە، ژمارەی دانیشتوانی شاری هەڵەبجە بە (6509) هەزار کەس دیاری کراوە، وەك لەم خشتەیەدا دیارە:

| ناوی شوێن | پیاو | ژن | کوڕ | کچ | تێکڕا |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| البجە (هەڵەبجە) | 2249 | 2103 | 1106 | 1051 | 650[4] |

ئەم ژمارەیەش، بە بەراورد بە شاری سلێمانی خۆیو قەزاو ناحیەکانی سەر بەو شارە، جگە لە خودی شاری سلێمانی، ژمارەی دانیشتوانی هەڵەبجە لە ژمارەی دانیشتوانی هەموو قەزاو ناحیەکانی سەر بە سلێمانی زۆرتر بووە لەو سەردەمەدا[5]. ئەوەی کە تێبینی دەکرێت لە سەرژمێرییەکەداو لەخشتەکەی سەرەوەدا بەرچاودەکەوێت ڕێژەی نێرینە (پیاو، کوڕ) زیاترە بە بەراورد بە ڕێژەی مێیینە (ژن، کچ).

مەسەلەی (سەربەستی ئافرەت) زۆرێك لە گەڕیدەو ڕۆژهەڵاتناسەکان، هەروەك چۆن باسی جوانی ئافرەتی کوردیان کردووە، باسی سەربەستی ژنانیشیان کردووەو بەو ئەنجامە گەیشتوون کە لەچاو ژنە دراوسێکانیاندا سەربەسترو ئازاترن، دیارە مەسەلەی سەربەستی ئافرەت زۆرتر پەیوەندی بە باری ئابووریو کۆمەڵایەتیو سیاسییەوە هەیە، بەتایبەتی لە بواری کارو فرمانو ئیشکردندا کە زیاتر لە لادێکاندا ئەو کاتە هەبووە، هاویەشی کردنی لەگەڵ پیاودا بۆ بەجێهێنانی کاری ڕۆژانەو ئەو ئەرکە جیاوازانە ئەو سەربەستییەی پێ بەخشیووە[6]، هەر بۆیە لەناو بنەماڵە فەرمانڕەواکانی ئەو سەردەمەدا، ڕەوتێکی ئاسایی بووە کە ژنی بە تەدبیر نەخشی گرنگ لە سیاسەتی عەشیرەتەکەیدا بگێڕێت، لەنێو ئەم جۆرە ژنانەشدا ڕەنگە (عادیلە خانم)ی هەڵەبجە لە هەمووان بەناوبانگتر بووبێت[7].

---

[1] ـ کەیوان ئازاد ئەنوەر: هۆزە کوردەکانی کوردستانی عێراق، گۆڤاری (پەیڤین)، ژ. (9)، سلێمانی، 2000، ل182.

[2] ـ هەردوو ناوچەی (نەورۆڵییو یەزدان بەخشی (شەمێران) دەکەونە ڕۆژئاوای شاری هەڵەبجەوە، ناوچەکانی نەورۆڵی دەکەونە نێوان هەڵەبجەو شەمێران (تویژەر).

[3] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو، ل190.

[4] ـ ڕۆژنامەی پێشکەوتن، ژ. (29)، 11/ نۆڤەمبەری/ 1920.

[5] ـ بۆ زانیاری لە بارەی ژمارەی دانیشتوانی سلێمانیو قەزاو ناحیەکانی بڕوانە (پێشکەوتن، ژ (29)، 1920/11/11.

[6] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل106.

[7] ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو، ل35ـ34.

هەر ئەو ناوبانگو سەربەستییەی (خانم) بووە وای لە (مێجەرسۆن)[1] کردووە کە بڵێت: "بە ڕاستی لەناو کۆمەڵی موسڵمانانندا ئافرەتی وەها بێ چەشنو بێ وێنە کەم هەیە، بە دەگمەن ئافرەتی وەها خاوەن دیوانو دەسەڵاتدارو بەدەستی خۆیان توانای بەکارهێنانی چەکی هەبێ هەڵدەکەوێ".

ولو كان النساء كمن ذكرنا

لفضلت النساء على الرجال[2]

شاکیر فەتاح کە لە ساڵی 1933 سەردانی هەڵەبجەی کردووە باس لەوەدەکات ئەوەی لەدوورەوە بڕواتە (هەڵەبجە)وە ڕیزە خانوویەکی بەرچاودەکەوێ، شارێ لە شارەڕازاوەکانی ئەوروپای دێتەوەبیر، ئەو خانوولانە هی (عوسمان پاشا، تاهیر بەگ، حامید بەگ)و دەوڵەمەندەکانی تری جافو هەڵەبجەیین. ژیان لە هەڵەبجەدا ژیانێکی ئەوروپاییانەیە. لێرە سەربەستی ژن لەگەڵ پیاودا لە هەموو شوێنێکی کوردستان زۆرترە. سێ ڕۆژ لە هەڵەبجە ماینەوە، جوولەکەکانی هەڵەبجە لە هی سلێمانی، ئافرەتی دیسانەوە لە هی گەلێ جێگای تر سەربەسترن. (کانی ژنان) کە لە ماڵی پاشاوە دیاریوو، ژنی زۆر جوانی ئەهاتە سەر. ژن لە هەڵەبجەدا زۆر خۆیان ئەڕازێننەوە، لە کاتی کارو فرمانیشدا هەر بەرگی جوان ئەپۆشن، سەری ژنی هەڵەبجەیی جوانترین سەری ژنانی کوردە کە من دیبێتم. جوانیان[3] زۆرە، پیاوانیش لەبەر ئەوە سەربەستن[4].

---

[1] ـ مێجەرسۆن ڕۆژی (1881/8/16) لەشاری (گینستگتۆن) لە ئینگلتەرا لەدایك بووە, کەسوکاری لەقەبی (sir)یان هەبووە, هەموویان بەزیرەکیو جوانی ناویان دەرکردبوو. لە ساڵی 1898 زانکۆی (کامبرج)ی بەپلەی شەرەف تەواوکردووە, زمانی فەرەنسی بەباشی فێربووەو حەزی لە زمانە ڕۆژهەڵاتیەکان کردووە, لە ساڵی 1902دا نێردراوە بۆ ئێرانو لەبانقێکدا کاریکردووە, لەپاش ساڵێك بەباشی لەتاران فێری زمانی فارسی دەبێو (عمرخیام) وەردەگێڕێتە سەر زمانی ئینگلیزی. دواتر دەڕوا بۆ شیرازو خۆی بەدیراسەکردنی ئیسلامەوە خەریك دەکات, شەوانە بەبەرگی مەلایەتیەوە دەڕواتە لای مەلاکان لە مزگەوت, لەساڵی1905 ئیعلانی موسوڵمانێتی خۆی دەکات, بەڵام لەژێرەوە هەر گاور بووە.

لەهەمان ساڵدا گەڕاوەتەوە بۆ ئینگلتەرا, دوای ماوەیەکی کەم گەڕاوەتە بۆ ئەستەمبوڵ, هەر لەوێ ناوی خۆی دەگۆڕێ بە (میرزاغولام حسەینی شیرازی)و گەشتەنهێنییەکەی دەست پێ دەکات بەناوچەکانی کوردستاندا, لەساڵی 1912 دەبێتە (معتمد) ی کونسوڵخانەی بەریتانیا لە شاری (موحەممەڕە) و, هەر لەوێش کتێبە بەناوبانگەکەی (رحلة متنكر) ی نوسیوە, ساڵی 1913 کراوە بەجێگری کونسوڵی وڵاتەکەی لە(قەسری شیرین), لەساڵی 1915 دا لەلایەن هەڵمەتی دەزگاکانی دۆزینەوە(حملة استكشافية) وە بۆخزمەتێکی دەستیاو(اعاره) لەگەڵ دەزگا جاسوسیەکانی وڵاتەکەی دەکەوێتە مەشق کردن, لەهەمان ساڵدا بانگ دەکرێ بۆ ئەوەی سەرپەرشتی دەرکردنی ڕۆژنامەی (بەصرە تایمز) بکات, ساڵی 1916 کاری چاودێریکردنی سیخوڕە ئەڵمانیەکانی پێ دەسپێردرێتو دەکرێتە جێگری کونسوڵی وڵاتەکەی لە(دیزفول). لەساڵی 1917 دوای داگیرکردنی خانەقین لەلایەن ئینگلیزەکانەوە دەکرێتە حاکمی سیاسی ئەو شارە, سۆن لەخانەقین توشی نەخۆشی(سیل) دەبێت ماوەی شەش مانگ دەڕوات بۆ ئوستورالیا بۆ چارەسەر. لەساڵی 1919بۆ 1921 حاکمی سیاسی سلێمانی بووە. جگە لەوانەش سۆن سەرپەرشتی دەرکردنی هەردوو ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستیو پێشکەوتنی ) کردووە.ساڵی 1921 سۆن گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەیو لەئابی هەمان ساڵدا لەلایەن پادشای بەریتانیاوە لەقەسری( بەکینگهام) خەڵات کرا. لە ساڵی 1922 دا دکتۆرەکان بۆچارەسەری نەخۆشیەکۆنەکەی دەینێرن بۆشاری (بیزەرتە) لەباکوری ئەفریقا, لەوێش تادێ نەخۆشیەکەی زیاد دەکات بۆیە دەینێرنەوە بۆئینگلتەرا, بەڵام ناگاتەوە وڵاتەکەی لەدەریاداو لەناو پاپۆڕەکەدا لە1923/2/24 دا دەمرێت.

[2] ـ میجرسون: رحله متنكر الى بلاد مابين النهرين وكردستان، ت. فؤاد جميل، ج1، مطبعة (الجمهورية) بغداد، 1970، ل276.

[3] ـ جوانی ژنو کچی جاف لای شاعیران ڕەنگدانەوەی هەبووە:

پیرەمێرد دەڵێت: بۆ پێمنانوێنی وێنەی فۆتۆغراف وێنەی شیرینی نازدارانی جاف.

گۆرانیش دەڵێت: لای من چ جامی نەشئە، چ میحرابی دینی عەشق ئەم چاوو، ئەو برۆی کچە کوردێکی جافییە. (شاعیرو مرۆڤ: ل105)

[4] ـ گەشتی هەڵەبجەو هەورامان (1933)، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی، 1974، ل10، 6، 15.

لە پەندی پێشینانداا (کچە) جاف نموونەی شۆخو شەنگیو جوانیو گەورەییو بەختەوەرییە، بۆیە وتراوە (ئەڵێی کچە جافیان بۆ دابەزاندووە)[1] .

سەبارەت بە خواردنەوەی (مەی)یش، لە شاری هەڵەبجەدا، هەروەك (شاکیر فەتاح) ئاماژەی بۆ کردووە، بەگزادەکانی جاف زۆربەی زۆریان خواردویانەتەوەو، گوێیان نەداوەتە نوێژو ڕۆژوو شێخو مێخ!! هەموو باخەکانی هەڵەبجە کەپرو هەواریان تیادا بووە، کە خەڵکی هەڵەبجە تیایاندا ڕایان ئەبوراد. ئەحمەد موختار بەگ کە ئێواران ئەهات، بە خۆیو چەند هاودەمێکییەوە لەگەڵ گۆرانی بێژێکدا، بە مەیو جامی مەیەوە ئەڕۆشتنە باخێك لە باخەکانەوە، هەتا چواری شەو دەیانخواردەوە، بە بەزمو ڕەزمەوە ڕایان ئەبوراد. جگە لە ئەو زۆر کەسی تریش بۆ خواردنەوەو ڕابواردن لە دەمەو ئێوارەوە، لەناو ئەو باخانەدا ڕایان ئەبوارد تا خەوتنان[2] .

سەبارەت بە بوونی جوولەکەش لە شارەکەدا، ناوچەی شارەزوور بەهۆی ئاوەدانیو زۆری ژمارەی دێهاتو گوندەکانیانەوە وایکردبوو، کە بەشێکی زۆر لە جوولەکەکانی کوردستان بکەونە ئەو هەرێمەوە. بە ڕادەیەکی ئەوتۆ شاری هەڵەبجە یەکێك بوو لەو ناوەندو مەڵبەندە سەرەکییانەی کە ژمارەیەکی زۆر جوولەکەی تێدا دەژیا[3] ، بە ڕادەیەك جوولەکەکان دووەمین بنەماڵە بوون لە دروستکردنی هەڵەبجەی نوێدا، هەروەك پێشتر ئاماژەمان بۆ کردووە[4] .

(مێجەرسۆن)یش، باس لەوە دەکات کە لەناو بازاڕی هەڵەبجەدا دوو نەتەوە (ڕەگەز) بەرچاو دەکەوتن کە ئەوانیش (کوردو جوولەکە) بوون، کە پێشوازییان لە خەڵکی نامۆ دەکردو بەخێرهاتنیان لێ دەکرد، لەم پێشوازی کردنەشدا هەردوو نەتەوە وەك یەکبوون[5] .

خەڵکی شاری هەڵەبجە دەڵێن جوولەکەکانی هەڵەبجە بەڕەسەن هەڵەبجەیی نین، بەڵکو دوای ئاوەدانکردنەوەی شارو پاش ئەوەی کە لە زۆر جێگەی جیهاندا جێگەیان پێ لێژ دەبێت دێنە پاڵ موسڵمانانو بەسەربەستی دەژین، بەڵگەش بۆ ئەوە خانووی جوولەکەکان بە پشت خانووی موسڵمانەکانەوە بووە، (کلێسا)[6] ی تایبەتی خۆیان هەبووە، خواپەرستییان تیادا کردووە[7] .

جوولەکەکان بە پیاوانی ئایینی خۆیان دەوت (مالوم) کە واتای (مامۆستا) دەگەیەنێ، ئەم مالومانە خوێندنی ئایینییان بە منداڵانی جوولەکە دەگوتەوە[8] . جوولەکەکان[9] بە گشتی بە زمانی کوردی باش دەدوان، لەناو خۆشیاندا بۆ (نوێژو دوعا)و بەڕێوەبردنی سەریمۆنیای (سرووتی) ئایینی زمانی (ئارامی)یان بەکاردەهێنا[10] .

---

[1] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل106.

[2] ـ گەشتی هەڵەبجەو هەورامان، ل16، 21.

[3] ـ ئەحمەد باوەڕ: جولەکەکانی کوردستان (بنەچەیان ـ دابو نەریتیان ـ هۆی کۆچکردنیان)، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، 2000، ل54.

[4] ـ حەکیم مەلا سالح: سەرچاوەی پێشوو، ل166.

[5] ـ رحلة متنكر ص296.

[6] ـ سالێك جولەکەکانی هەڵەبجە ئەیانەوێت کلێسەیەك دروست بکەن، بۆ ئەم مەبەستە پێویستیان بە دار هەبوو، بۆیە سەردانی (شێخ حسامەدین شێخ سراجەدین) دەکەن بۆ ئەوەی هەندێك داری چناریان بداتێ بۆ بیناکردنی کلێسەکەیان، ئەویش فەرمان دەدا بە موریدەکانی کە بڕۆن چەند داریان دەوێت بیاندەنێ، موریدەکان زۆر سەریان لەم هاوکارییەی شێخ سوڕدەمێنێ، ئەوانیش دەڕۆن لە باخەکەی (شێخ) نزیکەی (40) داریان بۆ دەبڕنو دەیان دەنێ. (گۆڤاری سلێمانی، ژ. (73)، 2006، ل44.

[7] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: سەرچاوەی پێشوو، ل26.

[8] ـ سەلاحی حەمەی زەینەب: هەندێك لە جولەکەکانی خەڵکی ئەمشارەو شاری هەڵەبجە، گۆڤاری (سلێمانی)، ژ. (73)، 2006، ل44.

[9] ـ جولەکەکان ئەم جەژنانەیان هەبووە (چەقالە، کەپرەشینە، کفتە). (بەکر حەمەصدیق عارف: سەرچاوەی پێشوو، ل27).

جوولەکەکان گۆڕستانی تایبەت بە خۆیان هەبووە، کە جیابووە لە گۆڕستانی موسڵمانەکان[1]، گۆڕستانەکەشیان لە گەڕەکی (مۆردانە)دا بووە، لەوێ مردووی خۆیان ناشتووە[2]، نەیانبردووە بۆ گۆڕستانی موسڵمانەکان[3].

هەڵەبجە لەو ساڵانەدا لەم گەڕەکانە پێکهاتبوو (پیرمحەممەد، جولەکەکان، پاشا، سەرای کۆن، کانی عاشقان، مۆردانە، سەرای نوێ)[4].

جوولەکەکان کاسبکار بوون، لە ماڵو سامان پەیداکردندا زۆر زەحمەتکێشو بەدەستو برد بوون، یارمەتی هەژارو کەمدەستەکانی خۆیان داوە، نەیانهێشتووە کەسیان موحتاجی سواڵ بێ[5].

سەبارەت بە پەیوەندییان لەگەڵ خەڵکی هەڵەبجەدا، پەیوەندییەکانیان باشو خراپ بووە، ئەوەی زۆر موسڵمان بووبێ، ئەوا هیچ سەوداو مامەڵەو تەنانەت قسەشی لەگەڵ نەکردوونو بگرە هەندێ جاریش ئازاریان داون، ئەوانەشی کە بیروباوەڕی ئایینییان زۆر بەهێز نەبووە لەگەڵیاندا تێکەڵ بوونو هەموو چەشنە مامەڵەیەکیان لەگەڵ کردوون، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی کەس ژنی نەداونەتێ، بە پێچەوانەوە هەندێ جار لێیان خوازراوە، ئەویش بە مەرجی ئەوەی کە موسڵمان بن[6]. بۆ نموونە: کچی یەعقوب کە ئەشراف جوولەکەکان بوو، شووی کردووە بە (مەلا ئەمینی کەریمی ڕەزا)، کە لە عەشیرەتی جاف (سادانی) بووە، هەروەها (حەلاوەخان)ی خوشکی (بلە یەعقوب) کە ژنی (حامید بەگ)ی جاف بووە، لە ساڵی (1923)دا موسڵمان بووەو شووی کردووە بە (حامید بەگ)، پێشتر خێزانی (میرانی خەیات) بووە، کە موسڵمان بووە، بەلایەوە دانەنیشتووە، هەروەها (ئەستێرەی کچی دوودە) موسڵمان بووەو ناوی خۆی ناوە (ئامینەخان)، پاشان شووی کردووە بە (باقی حەمە موورادخان) کە وەکیلی ماڵی پاشا بووە. (ئامینەخان)ی کچی (شاوڵەکەری زەڕەنگەر)یش، پاش ئەوەی موسڵمان بوو، شووی کردووە بە (تایەر بەگی جاف)[7].

هۆزێکی تری ناوچەکە کە نەخشی سەرەکییان هەبووە لە سیاسەتی ناوچەکەدا هەورامییەکان بوون، کە لە دوو بەشی زنجیرە چیای ئەسڵی زاگرۆسدا نیشتەجێن، ناویان لە ناوی مەڵبەندەکەی خۆیانەوە وەرگرتووە[8]، لە باری جوگرافییەوە شوێنو مەڵبەندی جافەکان (جافتان) لە هەردوو دیوی ئێرانو عێراقدا دراوسێو دەروازەی ڕۆژئاوای هەورامانە. هەورامییەکانو جاف لە دیوی ئێراندا بە شێوەیەکی بەربڵاو خزمایەتیو تێکەڵاوییان لەگەڵ یەکتردا هەیە[9][10]، لە دیوی عێراقیشدا بەتایبەتی جافەکانی هەڵەبجە، کە سەرۆکو کەسی هەڵکەوتوو لەناویاندا هەڵکەوتووە، دیسانەوە ئەمانیش جگە

---

[1] ـ ڕەشاد میران: ڕەوشی ئایینیو نەتەوەیی لە کوردستاندا، چ2، کوردستان، 2000، ل31.

[2] ـ شوان عوسمان مستەفا: کوردستانو پرۆسەی بە ئیسلام کردنی کورد، سەنتەری چاپو پەخشی تەما، سلێمانی، 2002، ل115.

[3] ـ جولەکەکان دوعای تایبەتییان بەسەر مردووەکانیاندا دەخوێند، هەروەها گۆڕی مردووەکانیشیان هەڵدەبەست بۆ ئەوەی لە لەناوچوون بیانپارێزن. سەر نیگا جولەکەکان بە پێچەوانەی موسڵمانەکانەوە بوو، سەری دەکەوتە خۆرهەلاتی، لە سەر تەنیشتی ڕاست درێژیان دەکردو ڕووشیان لە ڕۆژهەلات دەکرد. (جەمال ئیبراهیم لۆلۆ: مێژووی جولەکە لە کوردستاندا، گۆڤاری (خاك، ژ (113)، 2006، ل18).

[4] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: سەرچاوەی پێشوو، ل27.

[5] ـ گۆران هەڵەبجەیی: سەرچاوەی پێشوو، ل1037.

[6] ـ حەکیم مەلا ساڵح: سەرچاوەی پێشوو، ل166.

[7] ـ هەمان سەرچاوە، ل167.

[8] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: لاپەڕەیەك لە، ل26.

[9] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو، ل195.

[10] ـ هادی ڕەشید بەهمەنی: پەیامی هەورامان، چاپخانەی ژین، هەولێر، 2001، ل159.

لەوەی کە دراوسێی یەك بوون، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە تێکەڵاوی‌و خزمایەتیشیان هەبووە. بۆ نموونە: (حەنیفەخان)ی خێزانی جافرسان[1] و (حەپسەخان)ی مستەفاسان[2] لە جافەکان بوون[3].

لە نێوان ئەم دوو بەشە سەرەکییەدا زۆر تیرەی تر لە ناوچەکەدا نیشتەجێ بوویوون، وەك (کاکەییەکان)[4] کە بە (هاوارییەکان) ناسراون لە ناوچەکەدا[5]. مەڵبەندی سەرەکی هاوارییەکان پێکهاتووە لە سێ گوند کە دەکەونە ڕۆژهەڵاتی شاری هەڵەبجەوە ئەوانیش: (هاوار، هاوارەکۆن، دەرەتوێ) کە (دەرەتوێ) پێشی دەوترێت (حەوت ماڵە)، ئەم سێ گوندە پەیڕەوی ئاینی کاکەیی دەکەن[6]. هەرچەندە هاوارییەکان لەو سەردەمەدا هێشتا نەهاتبوونە شاری هەڵەبجە، پەیوەندی کۆمەڵایەتییان لەگەڵ هەریەکە لە جافەکان‌و شێخانی عەبابەیلێ‌و هەورامییەکاندا هەبووە.

سەبارەت بە بارودۆخە ئابوورییەکەشی، بەهۆی لەباری ئاوو هەواو زەوی پڕ پیتو بەرەکەتییەوە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە بەهۆی ئەوەی کە سەرکلاوەی شارەزوورو هەورامانەو ئەم شوێنەش هەر لە زەمانی خۆرپەرستییەوە مەڵبەندی ژیان بووە، خاوەنی دەشتو کەژو کێو بووە لەیەککاتدا، بە بەراورد بە شوێنانی تر کەمتر نەخۆشی تیادا بڵاوبووەتەوە بەتایبەتی تاعونو مەلارياو سیلو گولی[7].

(د. شاکر خەصباك)یش دەڵێت: "نموونەی ئەو شارانەی کە دەکەونە ڕێڕەوی ناوچە شاخاوییەکان، ئەو ڕێڕەوانەی کە ناوچە شاخاوییەکان بە دەشتاییەکانەوە دەبەستێتەوە، بەو شێوەیە ئەو ناوچەیە لەبار دەبێت بۆ کۆکردنەوەی دوو ئابووری جیاواز، ئەویش ئابووری شاخاوی کە بریتییە لە (ئاژەڵو بەرووبوومەکانی وەك دارستانو تەختەو دارە)، لەگەڵ ئابووری دەشتایی کە بریتییە لە (بەروبوومە کشتوکاڵییەکانو ماددەو پیشەسازییەکان)، ئەمە سەرەڕای گرێیەندی هاتوچۆ. نموونەی ئەم جۆرە شارانەش، شاری (هەڵەبجە)یە کە شوێنێکی لەباری هەیەو شارێکی سنووری نموونەییە، کە کەوتووەتە لای بەیەکگەیشتنی دەشتی فراوانی شارەزوورو زنجیرە شاخەکانی هەورامانەوە، ئەمە کۆنترۆڵی کەلێنی ئەو

---

[1] ـ (جافرسان کوڕی حەمە سەعید سان کوڕی عوسمان سان)ە. دایکی ناوی (فەیروزە خانمی کچی شێخ عەلی عەبابەیلێ)یە، کاتێك باوکی کوژراوە، جافرسان هێشتا لە دایك نەبووە، پاش (6) مانگ لە تەکیەی (دەوڵەت ئاوایی ڕوانسەر) لەدایك بووە.
جافرسان (1885 – 1945) یەکێکە لە سانە بەناوبانگەکانی هەورامان. جافرسان لە ماوەی ساڵانی (1894 – 1913) لە ناوچەیەکی بەرفراواندا، کە هەر لە خۆرهەڵاتی هەڵەبجەوە بۆ سنووری پاڵنگانو جافەکانی (جوانڕۆ) درێژدەبێتەوە حوکمڕانی نکوڵی لێ نەکراوەو هیچ مشتو مڕێکی لەسەر حوکمڕانییەکەی نەبوو، ساڵی 1931 حکومەتی ئێران هێرشێکی گەورەو بەرفراوانی کردە سەرناوچەکانی هەورامانی (لهۆنو تەخت)، هێزێکی لە کرماشانەوە بۆ هەورامانی لهۆنو هێزێکی تر لە سنەوە بۆ (ڕەزاو دزڵی) هاتوون، پاش ساڵێك لە بەرەنگاری، جافرسان بە ناچاری ڕووی کردە هەورامانی ئەم دیو، دواتر حکومەتی عێراقی مافی پەنابەرێتی داوەتی‌و لە شاری (ڕومادی) نیشتەجێ بووە، حکومەتی ئێران زۆر هەوڵیداوە دەسەڵاتدارانی عێراق ڕازی بکات بە تەسلیمکردنەوەی، بەڵام بێ سوود بوو، جافرسان تا ساڵی 1941 وەك پەنابەرێك ژیاوە، لەو ساڵەدا لەشکری ڕووسیاو بەریتانیا چوونە ناو ئێرانەوە، (جافرسان)یش گەڕاوەتەوە بۆ هەڵەبجە، لەسەر وەسیەتی خۆی (کەریم بەگی کوڕی کراوە بە سانی هەورامان، خۆشی پاش ماوەیەکی کەم مردووەو لە گۆڕستانی عەبابەیلێ لە نزیك گۆڕی (تایەر بەگ) لە هەڵەبجە بە خاك سپێردراوە. (ئەیوب ڕۆستەم: هەورامان (لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی ـ کلتووری)، ب1، سلێمانی، 2004، ل83).

[2] ـ (سان) کورتکراوەی (سوڵتانە)، لە سەردەمی سەفەوییەکاندا بەسەرۆکە مەزنەکانی هەورامان وتراوە. (ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو، پ18، ل195).

[3] ـ هادی ڕەشید بەهمەنی: سەرچاوەی پێشوو، ل159.

[4] ـ کۆمەڵێکی ئایینین لە نێو نەتەوەی کورددا، لە ڕابردوودا لە ناوچەکانی خۆیاندا بە دوورەپەرێز دەژیان، خاوەنی باوەڕی ئایینی‌و گەلێ مۆرکو نەریتی تایبەت بە خۆیان هەیە. (ڕەشاد میرانی: سەرچاوەی پێشوو، ل152).

[5] سالنامەی سلێمانی، 1999، ل163.

[6] ـ ڕەمەزان هەمیرخان (کۆساری): هاوارو هاوارییەکان، چاپخانەی ڕامان، 2005، ل59.

[7] ـ حەکیم مەلا ساڵح: سەرچاوەی پێشوو، ل43.

زنجیرەیە دەكات، كە ڕێگەی نێوان دەشتی شارەزوورە لەگەڵ زنجیرەشاخە بەرزەكانی هەورامان، بۆیە هەڵەبجە مەڵبەندی بازرگانی دوو ناوچەی جیاواز بووە (دەشتاییەكانی شارەزوورو ناوچە شاخاوییەكانی هەورامان)، هەروەها دەكەوێتە سەر یەكێك لە ڕێگا هەرە گرنگەكانی ئەو سەردەمە كە لە ڕۆژئاواوە بەرەو ئێران دەڕۆیشتو بەسەر سلێمانیدا تێدەپەڕی"[1] .

ئەمانە بوونە هۆی گەشەسەندنی شارەكە، جگە لەوەش كردنی هەڵەبجە بە مەڵبەندێكی بازرگانی لەلایەن هۆزی جافەوە ئەوەندەی تر پەرەی سەند، ئەو سەردەم هەڵەبجە باشترین مەڵبەندێ بوو كە شایانی چالاكییە بازرگانییەكان بێت، چونكە دەكەوتە ناوەندی گەرمیانو كوێستانی جافەكان، واتە لە نێوان (سنە) لە هاوینداو (دەشتی شارەزوورو كەركووك) لە زستاندا، هۆزی جاف بە گشتی لە هەڵەبجە مەڕوماڵاتو بەرهەمەكانیان دەفرۆشت، دانەوێڵەو كوتاڵو چەكی پێویستیان هەر لەوێ دەكڕی، لەلایەكی تر پێشكەوتنی كشتوكاڵ لە دەشتی شارەزووردا ڕۆڵی لەو گەشەسەندنەدا هەبوو، چونكە مەڵبەندەكە وایكرد هەڵەبجە ببێتە بازاڕێكی سەرەكی بەروبوومەكانی ئەو دەشتە[2] .

ئابووری ناوچەكە بە گشتی كشتوكاڵو ئاژەڵداری بووە، بەرهەمی سەرەكی زستانە گەنمو جۆ بووە، لەو ساڵانەدا كە بەرهەم باشبوویێ، جگە لە پڕكردنەوەی پێداویسییەكانی خۆیان بەو بەرهەمانە، زیادەكەشیان بۆ دەرەوە دەنارد[3] .

لە وەرزی هاویندا لەو جێگایانەشی كە ئاو هەبوویێ، سەرەڕای ناڕازی بوونی حكومەتو زیانێك كە بە هۆی مەلاریاوە تووشی خەڵكەكە دەبوو، دەوترا ئەم نەخۆشییەش لە جاڕە مەرەزەكانەوە بڵاودەبێتەوە، وەرزێرەكان بۆ دابینكردنی ژیانیان چەڵتووكیان دەچاند[4].

هەڵەبجە كە ناوچەی كشتوكاڵو چاندن بووە، بەرهەمەكانی (دانەوێڵە، گەنم، جۆ، توتن، ئاژەڵ)ی هەبووە، لەبواری پیشەسازیشدا بەرهەمەكانی (بەڕە، مافوور، دارتاشی، ئاسنگەری، چەقۆ، كاسەو كەوێڵ)ی ناوچەی هەورامانی هەبووە، لەگەڵ گەشتوگوزار كە بەهۆی سازگاری كەشو هەواكەیەوە بووە[5] . جگە لە باخی (هەنار، گوێز، توو، تریێ) لە ناوچەی هەورامان، هەروەها بەخێوكردنی (مەڕو بزنو مانگاو هەنگ).

ناوچەی هەورامان كە لە ڕووی ئیدارییەوە سەر بەم قەزایە بووە، دانیشتوانی تەوێڵە لەو سەردەمەدا دەیەها جۆر بەرهەمیان دەهێنایە بەرهەم وەك: چنینی شاڵ بۆ ڕانكو چۆغەو دروستكردنی كوڵەباڵو فەرنجیو كڵاوو خوریو دروستكردنی كڵاشو قەلەمڕو پنەو تیرۆكو گەلێك بەرووبوومی تر[6] .

بوونی بازاڕێك بۆ كڕینو فرۆشتنی بەرهەمەكانی ئەم دوو ناوچە جیاوازە،لە شوێنێكی نزیك بە هەردوو هەرێمەكە لە بازاڕێكی وەكو شاری هەڵەبجەدا، پێویستییەكانی هەردوولای دابین كردووەو خاڵێكی ڕاكێشانی دانیشتوانی هەردوو

---

[1] ـ الاكراد دراسة جغرافية أثنوغرافية، مطبعة (شفيق)، 1972، ص225، العراق الشمالي، بغداد، 1973، ص310.

[2] ـ د. شاكر خصباك: الأكراد، ص225.

[3] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو، ل41.

[4] ـ هەمان سەرچاوە، ل41.

[5] ـ كەریم زەند: سەرچاوەی پێشوو، ل447.

[6] ـ جەمال بابانو ئەوانی تر: سلێمانی شارە گەشاوەكەم، ب3، چ3، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، 2000،ل219.

هەرێمەکە بووە بۆ نیشتەجێبوون لە هەڵەبجەدا[1]، کە دەرەبەگ[2] حوکمی تیادا کردووە هەروەك زۆربەی ناوچەکانی تری کوردستان[3].

وەکو مێژوویەکی زۆر نزیك دەریخستووە،هەموو دەشتی شارەزوور موڵکی میرەکانی (بەگزادەکانی) جاف بووە[4]، جاف هەر لە دەشتی (کۆکزی) سەر بە (قەرەتەپە) تا نزیکی (بیجار)ی ئێران هەر زەویو موڵکێك کە لە ڕێگەی کۆچو ڕەویاندا بوو، میرەکانی جاف بە نرخێك لە خاوەنەکانیان دەکڕی، ئەوەشیان بۆ ئەوە دەکرد، کە هۆزی جاف لەسەر (لەوەڕو پاوان) لەگەڵ خەڵکدا گرفتاری شەڕو ئاژاوە نەبن[5].

شاری هەڵەبجە لە ڕووی بازرگانییەوە زۆر شوێنێکی گرنگو ستراتیجی بوو، کە خۆی لە دوو جۆر بازرگانیدا دەنواند:

**یەکەم: بازرگانی ناوخۆ**, هەروەك پێشتر ئاماژەمان بە شوێنە جوگرافییەکەی هەڵەبجەو بایەخە ئابوورییەکەی کرد، ئەم شارە وەکو خاڵێك لە نێوان دوو هەرێمی جیاواز لە ڕووی بەرهەمهێنانو تۆبۆگرافیاوە، واتە هەرێمی ناوچە شاخاوییەکانی هەورامانو شنرویو باڵامبۆ لەلایەك، هەرێمی دەشتی شارەزوور لەلایەکی تر، کە هەریەکەیان تایبەتمەندی خۆی هەبووە لە بەرهەمهێناندا، ناوچە شاخاوییەکان بە بەرهەمی میوە ناسراوە لەگەڵ هەندێ بەروبوومی پیشەسازی دەستی بەرامبەر بە دانەوێڵە، بەرهەمەکانی مەڕوماڵات لە دەشتی شارەزووردا[6].

**دووەم: بازرگانی دەرەکی**، لەبەرئەوەی هەڵەبجە لەو سەردەمەدا هێڵی بازرگانی نێوان هەردوو کوردستانی (ڕۆژهەڵاتو باشوور) بووە بە بەغداوە، بە کورتی هێڵی بەستنەوەی ناوچەکانی (سنەو کرماشان) لە هەڵەبجەوە بەسەر پردی زەڵمی کۆنو ناوچەی جافایەتیو قزرباتیو سەلمانپاك بووە بە بەغدادەوە، هەروەها دوو بەشە گرنگەکەی جاف (مورادیو وەڵەدبەگی)و بەیەك گەیاندنو نزیککردنەوەی دوو زاراوەی گرنگی زمانی کوردی بوو کە ئەوانیش بریتین لە (گۆرانیو کرمانجی ناوەڕاست)[7].

هەڵکەوتنی شارەکە لە نزیك گوزەرگایەکی (معابرو ممرات) شاخاویدا کە دەشتی شارەزوورو هەورامانو شاری سلێمانی بەستبووەوە بە چەند شارێکی گرنگی ڕۆژئاوای ئێرانەوە بەتایبەتی (کرماشانو هەمەدانو سنە) چالاکییەکی بازرگانی تایبەتی بە شوێنی شاری هەڵەبجە بەخشی بوو، ئەم چالاکییەش هەر لە کۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەوە گرنگی تایبەتی خۆی هەبووە، هەندێ لەو گەڕیدانە (السواح) کە لەو ماوەیەدا سەردانی ناوچەکەیان کردووە بە ڕوونی باسیان لەو چالاکییە کردووە[8]، (سۆن) زیندووترین نموونەیە کە بۆ ماوەیەکی زۆر لە هەڵەبجە ماوەتەوەو هەر زوو گرنگی ئەم ناوچەیەی بۆ حکومەتی ئینگلیز دەرخست[9]. خۆی وەکو بازرگانێکی شیرازی نیشانداوە، گرنگی هەڵەبجە کاتێك ڕوون دەبێتەوە ئەگەر ئەو ڕاستییە لەبەرچاو بگرین، هەڵەبجە لە ڕێگای گوزەرگای (تەوێڵە ـ نەوسوود)ەوە نزیکترین شاری

---

[1] ـ فەیروز حەسەن: سەرچاوەی پێشوو، ل5.

[2] ـ (دەرەبەگ) وشەیەکی تورکییە، لە دوو بەش پێکهاتووە، (دەرە) واتە دۆڵ، (بەگ یان بەی) واتە: ئاغا دێت، کەواتە (دەرەبەگ) بە مانای (ئاغای دۆڵ) دێت. (موکەڕەم تاڵەبانی: دەرەبەگێتی لە کوردستاندا، گۆڤاری (زانیاری)، ژ (3)، 1970، ل23.

[3] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: سەرچاوەی پێشوو، ل22.

[4] ـ محەمەد سەعید جاف: هەڵوێستێکی جوامێرانە، گۆڤاری (ڕەنگین)، ژ (68)، 1994، ل15 .

[5] ـ هەمان سەرچاوە: ل14ـ15.

[6] ـ فەیروز حەسەن: سەرچاوەی پێشوو، ل5.

[7] ـ بەختیار غەفور هەڵەبجەیی: کتێبی هەڵەبجە، 2006، ل 11 .

[8] ـ فەیروز حەسەن: سەرچاوەی پێشوو، ل5ـ6.

[9] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: لاپەڕەیەك لە، ل12 .

کوردستانی عێراقە بەشارێگەی (highway) بازرگانی نێوان رۆژهەلاتی دوورو رۆژهەلاتی ناوەڕاست، لەوێشەوە بە شاری کرماشاندا تێدەپەڕی تا دەگاتە بەغداد. بەشێکی پەیوەندی بازرگانی سلێمانیو کەرکوك لەگەڵ سنەو هەمەدانو کرماشاندا لەگەڵ شاری هەڵەبجەدا بووە [1].

ئەو ڕێگایانەی هاتووچۆیان تیادا کراوە لە ڕابردوودا بە هۆی کاروانی ولاخەوە کاسبیو بازرگانی تیادابووە [2]. هەڵەبجە پەیوەندی هاتوچۆی بازرگانی بەم شوێنانەی خوارەوە هەبووە:

1- هەڵەبجە - خانەقین - بەغدا.

2- هەڵەبجە - شارەزوور - سلێمانی - موسڵ.

3- هەڵەبجە - پاوە - کرماشان.

4- هەڵەبجە - مەریوان - سنە - زنجار - تاران [3].

لەلایەکی ترەوە، بوونی کەمایەتی وەکو جوولەکە لەناو شاری هەڵەبجەدا، خۆی لە خۆیدا بەلگەیەکی گرنگە بۆ کاریگەری فاکتەری بازرگانی لەسەر گەشەسەندنی شارەکە، لەهەڵەبجەی سەرەتای سەدەی بیستەمدا زیاتر لە (100) ماڵی جوولەکە دانیشتووی ڕەسەنی شارەکە بوون، گەڕەکەکەشیان ڕێژەیەکی گەورەی لە بەشە نیشتەجێییەکەی شاری هەڵەبجەی پێکدەهێنا، بوونی کەمایەتی جوولەکە وەك پێوەرێك بۆ چالاکی بازرگانی ناوەوەو دەرەوەی هەڵەبجە، لەو ڕاستییەوە سەرچاوە دەگرێت، کە جوولەکە وەکو دابو نەریتی خۆیان لە رۆژهەلاتو لە رۆژئاواشدا زیاتر سەرگەرمی بازرگانی کڕینو فرۆشتنو سەرافی [4] و زەڕەنگەری بوون، کەمتر خۆیان بە کشتوکاڵو کارەکانی ترەوە خەریك کردووە، لەبەر ئەوە ئەو ڕێژە نائاساییەیان لە شاری هەڵەبجەدا ئەگەر بەراورد بکرێت بەڕێژەی ئەم کەمایەتییە لە شارێکی وەکو سلێمانی دەردەکەوێت تا چ ئەندازەیەکی چالاکی بازرگانی لەم شارەدا برەوی هەبووە [5].

ئەمانەش هەندێ لە جوولەکە دەوڵەمەندو بازرگانەکانی ئەم شارە بوون:

1- حەکیم خوایە: زۆر شارەزابووە لە داودەرمانی گژوگیادا.

2- ئیسحاق ئاشێر: بازرگان بووە.

3- دانا مووسا: بازرگان بووە، براکەشی لە سلێمانی ناوی (شاقی بابا) بووەو (عەتار) بووە.

4- خواجە دوودە: بازرگان بووە.

5- خواجە یایە: فرۆشیاری دەرمانی گژوگیا بووە.

چەرچییشیان هەبووە شتیان گێڕاوە بە کۆڵانەکاندا، یەکێ لەوانە (کاکەحەمەی) بووە، ژنان بە (کاکە جوو) ناویان بردووە، ژمارەیەکی زۆر لەو کۆڵگێڕانە لە دێهاتەکانی هەڵەبجە، شارەزوور، هەوراماندا قوماشیان ئەفرۆشت [6].

(مێجەرسۆن)یش، باس لەوە دەکات کە لەناو بازاڕی هەڵەبجەدا (52) دوکان هەبووە، (20) لەو دوکانانە کاریان فرۆشتنی قوماشی کەتانو بازرگانی کوتاڵ بووە، زۆربەشیان لە جوولەکەکانی ئەو شارە بوون، جوولەکەکان زۆربەی ئەو

---

[1] - فەیروز حەسەن: سەرچاوەی پێشوو، ل6.

[2] - شەوکەتی حاجی موشیر: کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە بەهاری 1988، سلێمانی، 1998، ل52.

[3] - هەمان سەرچاوە، ل52.

[4] - سەرافی بریتییە لە گۆڕینەوەی دراو بە دراو.

[5] - فەیروز حەسەن: سەرچاوەی پێشوو، ل6.

[6] - سەلاحی حەمەی زەینەب: سەرچاوەی پێشوو، ل44.

کەسانەیان پێکدەهێنا کە کاریان بازرگانیکردن بووە[1]. هەر بۆیە زۆربەی جوولەکەکان لە کارو کاسپیدا وریاو شارەزا بوون، لەو کارو کاسپییانەش کە کردوویانە: زەرەنگەری، بازرگانیو عەتاری بووە[2]. لەبەر ئەوە شتێکی سروشتی بووە، کە جوولەکەکانی شاری هەڵەبجە لە ڕووی داهاتو ئاستی ئابووریو کاروباریانەوە لە دیارترینو دەوڵەمەندترین دانیشتوانی شاربن، بەجۆرێك زۆربەی دوکانەکانو بازاڕی شار بە دەستی ئەوانەوە بووە.[3]

## باسی دووەم: بارودۆخی سیاسی و کارگێڕی

### یەکەم: هەڵەبجە لەسەردەمی محەمەد پاشای جافدا

شاری هەڵەبجە، بەر لەوەی ببێتە مەڵبەندی قەزا، لە ڕووی ئیدارییەوە سەر بە ناحیەی (خورماڵ = گوڵعەنبەر) بوو، ئەوکات هێشتا شاری سلێمانی بنیات نەنرابوو، ماوەیەکی دوورو درێژ لە چوارچێوەی قەڵەمڕەوی بابانەکاندا بووە، دوا حکومڕانی بابانەکان لە شارەکەدا (حەمە ساڵح بەگی بابان) بووە[4].

هەموو گۆڕانێکی قووڵو سەرەکی لە بارودۆخی سیاسیدا، ڕەنگدانەوەی دەبێت لەسەر قەبارەی شارو ژمارەی دانیشووانەکەی بە سوودی شار یاخود زیانی، هەر لەسەرەتای سەدەی شانزەهەمەوە شاری (گوڵعەنبەر = خورماڵ) تەنها شاری گرنگی دەشتی شارەزوور بووە بۆ بانی ئێران لە ڕێگەی ئەو گوزەرگایانەوە کە بە (دزڵی ـ مەریوان) کۆتاییان دێت، ئەم شارە بە درێژایی زیاتر لە سێ سەدەو نیو گەورەترین ناوەندی شارستانی هەرێمی شارەزوور بوو، ئەم شارە لەگەڵ قەڵاکەیدا بە ناوی (قەڵای زەڵم) وەکو پێگەیەکی سەربازیش بووە بۆ گەشەدان بەقەڵەمڕەوی میرنشینی ئەردەڵان لە هەرێمی شارەزوورو ڕێی بچووکو هەورامانو شارباژێرو قەرەداغو گەرمیان. سوڵتانەکانی عوسمانی بۆ لاوازکردنی میرنشینی ئەردەڵان کە پایتەختەکەی شاری (سنە) بوو زۆرجار هێرشی گەورەیان کردۆتە سەر (گوڵعەنبەر) بەمەبەستی نەهێشتنی دەسەڵاتی ئەو میرنشینە بەم دیو ڕیزە چیاکانی هەوراماندا.

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم بەدواوە کۆتایی بە دەسەڵاتی میرنشینی ئەردەڵان لە (سنە) دێ، لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییە سیاسییەدا شاری (گوڵعەنبەر) پلەو پایەی خۆی وەکو شارێکی هاتوچۆی سەر گوزەرگایەکی شاخاوی (ممر جبلی)، وەکو پێگەیەکی سەربازی بۆ گەشەدان بەقەڵەمڕەوی دەسەلات وەکو هێڵی بەرگری یەکەم لە میرنشینی ئەردەلان لەبەردەم هێرشی عوسمانییەکاندا لەدەست دەدا، ئەم گۆڕانەش هاوکاتە لەگەڵ نەمانی دەسەڵاتی میرنشینی باباندا لە سلێمانی لە ساڵی (1851ن)دا، هەروەها هاوکاتە لەگەڵ هەوڵدانی دەسەڵاتدارانی عوسمانی بۆ نیشتەجێکردنی هۆزی جاف لە ناوچەی شارەزووردا. ئەم هۆکارانە زەمینەیان سازکرد بۆ گۆڕینی قورسایی دانیشتوان لە (گوڵعەنبەر)ەوە بۆ (هەڵەبجە)، بەو شێوەیە شاری هەڵەبجە دەبێتە میراتگری تایبەتمەندییەکانی شاری (گوڵعەنبەر). لە کۆتاییشدا ئەم شارە دەبێتە شارۆچکەیەكو هەڵەبجەش بەدەوام لە گەشەکردندا بوو[5].

لە مێژووی نوێدا ناوی شارەزوورو عەشیرەتی جاف پێکەوە گرێدراون، لە هەرکوێیەك باسی شارەزوور دەکرێ ڕەشماڵو چەکو تفاقو خزمەتو دەسەڵاتی جافیش ناودەبرێت[6].

---

[1] ـ مصدر السابق، ص296.

[2] ـ سەلاحی حەمەی زەینەب: سەرچاوەی پێشوو، ل45.

[3] ـ ئەحمەد باوەڕ: سەرچاوەی پێشوو، ل54.

[4] ـ ئەیوب ڕۆستەم: سەرچاوەی پێشوو، ل36.

[5] ـ فەیروز حەسەن: سەرچاوەی پێشوو، ل7ـ6.

[6] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: هەڵەبجە لە ئاوێنەی چەند دێڕێکی مێژوودا، گۆڤاری (خەزان)، ژ (4)، 2001/3/16، ل3.

لەدوای مردنی (کەیخەسرەو بەگ)ی جاف، (حەمە پاشا)ی کوڕی لە تەمەنی (14) ساڵیدا لەلایەن بەگزادەکانەوە دانرا بە سەرۆکی عەشیرەتی جاف، بۆچوونێکی تر دەڵێت: "لە تەئریخی (1248ك)دا محەمەد پاشا بە عومری (16) ساڵییەوە ئەبێ بە ڕەئیسی عمومی جاف و بەگزادە"[1].

بەگزادەکانی جاف هەر لە سەردەمی بابانەکانەوە، چ لە کوردستانی عێراق و چ لە کوردستانی ئێراندا بنەماڵەیەکی خاوەن ناوو ناونیشان و خانەوادەیەکی بە دەسەڵات بوون، هەر ئەوان پێشەواو گەورەو دەمڕاستی عەشیرەتی گەورەی جاف بوون بە هەموو لق و پۆپییەوە[2].

حەمە پاشای جاف پیاوێکی زۆرئازاو چاونەترس و ژیر بووە. توانیویەتی هۆزی جاف یەك بخات و بیانکاتە خاوەن دەسەڵاتێکی گەورەو فراوان. سەری بۆ کاربەدەستانی هەردوو دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی شۆڕ نەدەکرد، هەردوو دەوڵەت هەمیشە مەترسییان لێی هەبووە، لەبەر ئەوە هەوڵیانداوە کە بەهۆی میرنشینەکان یاخود لە ڕێی دوژمنانی تری هۆزی جافەوە لەناوی بەرن[3].

(ئیدمۆندز)یش، باس لەوە دەکات کە حەمە پاشای جاف دوا سەرۆکەکانی جاف بووە کە تەواوی هۆزەکانی جاف لەژێر دەستدا بووە[4]. بنکەی سەرەکی لە هەڵەبجە بوو، لە ساڵیشدا چەند مانگێك لە پێنجوێن دادەنیشت، حەمە پاشا دەستیکرد بەکاری ئاوەدانکردنەوە، نووسەری تەئریخی جاف دەڵێت: "پێنجوێن و ئەڵەبجە کە ئێستا دوو قەصەبەن (قەزا)ن، لە پێش محەمەد پاشادا دوو دێی بچووك بوون، ئەو کردنی بە شارو قەیسەری و خانووی تیادا دروستکردن"[5].

پاشا بەم کارانەی ناوبانگێکی باشی پەیداکرد، کاتێك عوسمانییەکان بەمە دەزانن لە (باب العالی)ەوە پلەوپایەی (پاشایەتی) پێدەبەخشن، لێرەوە (محەمەد بەگ) بوو بە (محەمەد پاشا) و بناغەی پاشایەتی لەناو جافدا دامەزراند، هەر ئەوکات لەلایەن تورکەکانەوە دەکرێتە قایمقامی هەڵەبجە[6]. هەرچەندە سەرچاوە مێژووییەکان مێژووی بە قەزابوونی هەڵەبجەو دەستنیشانکردنی (حەمە پاشا)[7] وەکو یەکەم قایمقامی ئەو قەزایە دیاری ناکەن، بەڵام لە بەڵگە مێژووییەکاندا وادەردەکەوێت کە ئەم گۆڕانکارییە لە کۆتایی ساڵانی شەستی سەدەی نۆزدەهەمدا بووبێت، کە هاوکاتە لەگەڵ دەسەڵاتداری (مەدحەت پاشا 1869 ـ 1872)، مەدحەت پاشاش زیاتر لە هەر دەسەڵاتدارو والییەکی تری عوسمانی پێش خۆی بەوە ناسراوە کە زۆربەی توانای کارگێڕی خۆی بۆ سەقامگیرکردنی هۆزەکانی سەرانسەری عێراق تەرخان کردووە[8].

---

[1] ـ کەریم بەگی فەتاح بەگ: سەرچاوەی پێشوو، ل46، 164.

[2] ـ جەمال بابان: سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ب2، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، 1998، ل24.

[3] ـ کەریم بەگی فەتاح بەگ: سەرچاوەی پێشوو، ل46.

4 ـ کورد تورك عەرەب، ل191.

5 کەریم بەگی فەتاح بەگ: سەرچاوەی پێشوو، ل185ـ186.

[6] ـ حەکیم مەلا ساڵح: سەرچاوەی پێشوو، ل114.

[7] ـ زۆربەی ئەو نووسەرو مێژوونووسانەی کە (حەمە پاشا)ی جاف بە یەکەم قایمقامی هەڵەبجە دادەنێن، سەرچاوەی زانیارییەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ (کەریم بەگی فەتاح بەگ: تەئریخی جاف)و (حەسەن فەهمی بەگی جاف: مێژووی هۆزی جاف و مەحمود پاشای جاف). بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستییە چەندین نووسەری گەورەی وەکو (محەمەد ئەمین زەکی بەگ و د.حەسەن جاف)ی کوڕی کەریم بەگی فەتاح بەگ لەچەندین نووسینی جیاجیایاندا کە لە کتێب و گۆڤارەکاندا بڵاویان کردووەتەوە, باسی ئەوەیان کردووە کە حەمە پاشا یەکەم قایمقامی هەڵەبجە بووە نەك عوسمان پاشای کوڕی . لە نووسینی ئەم لێکۆلینەوەیەشدا ئاماژەمان بە ژمارەیەك لەو سەرچاوانە کردووە.

[8] ـ فەیروز حەسەن: سەرچاوەی پێشوو، ل2.

محەمەد پاشا تا ساڵی (1873) قایمقامی هەڵەبجە بووەو سەرۆکایەتی هۆزی جاف لە دەستدا بووە[1]، ساڵی 1873 محەمەد پاشا لەگەڵ کاربەدەستانی ئەوکاتی عوسمانی لە بەغداد نێوانیان تێکچوو، هۆی ئەم تێکچوونەش بۆ ئەوە دەگەڕایەوە کە حکومەت تازە قانونی تاپۆی دانابوو، داوایان لە پاشا کرد کە لە ناوچەی شارەزوورو جافدا زەویو زار بکرێت، بۆ ئەوەی کە جافی کۆچەری تیادا نیشتەجێ بکات. پاشاش ئەوەی ڕەتکردەوە، چونکە پێی وابوو دامەزراندنی جافو خەریکبوونیان بە کشتوکاڵەوە مانای دیلبوونیانە بە دەست حکومەتەوە. ئەو موڵکو زەویو زارانەش دەبنە هۆی بەستنەوەیانو سەربەستی خۆیو عەشیرەتەکەی لەم نێوەندەدا لەکیس دەچێت، بۆیە حەمە پاشا دەڵێ ئەم دیلییە چۆن قبووڵ کەین؟ ئێمە لە ئێستادا لە نێوان ئێرانو عوسمانیدا سەربەستین کوێمان بەدڵ بوو لەوێ دەنیشینەوە، چۆن قاچی خۆمان دەخەینە ناو زنجیری کشتوکاڵەوە؟! لەبەر ئەوە محەمەد پاشاو خزمانی لە بەگزادەکانی بارام بەگیو وەڵەدبەگیو ژمارەیەکی زۆر لە عەشیرەتی جاف لە ساڵی 1873 پەنا دەبەنە بەر ئێران[2]. دوابەدوای (محەمەد پاشا)، (محەمەد بەگی قادر پاشا) دەبێتە قایمقامی هەڵەبجە[3].

حەمە پاشا لەلایەن حکومەتی ئێرانەوە ڕێزێکی زۆری لێگیراو نازناوی (خان)یان پێبەخشی، ناوچەکانی (زەهاوو قەسری شیرینو هۆرێنو شێخان)ی پێبەخشراو (عوسمان بەگ)ی کوڕی کرا بە حاکمی جوانڕۆ. حەمە پاشا نزیکەی (3) ساڵ لە ئێران مایەوە، لەو ماوەیەدا هۆزی جاف دەسەڵاتو توانایەکی زۆریان پەیداکرد[4].

پیرەمێردی شاعیر دەڵێت: "ئێلی جاف لە تەمەنی دواییدا محەمەد پاشای کوڕی (کەیخەسرەو بەگ)یان لێهەڵکەوت، ئێلی مورادی گەیاندە پلەی ئازادی، خۆی لە بەینی دوو دەوڵەتی وەك ئێرانو تورکدا شێوەی لامەرکەزییەکی پەیداکرد"[5].

لەماوەی ئەو سێ ساڵەی کە حەمە پاشا لە ئێران بوو، دەوڵەتی عوسمانی لە ڕێگەی باڵوێزخانەی خۆیەوە لەتاران داوای دەستگیرکردنی محەمەد پاشاو سپاردنەوەی بە والی بەغداد دەکرد، بەڵام ئێران ئەم داوایەی ڕەتدەکردەوە، هەروەها دەسەڵاتی دەوڵەتی ئێرانیش لای خۆیەوە مەبەستی ئەوەی هەبوو کە دەسەڵاتی جاف کەم بکاتەوە، ئەمەش لە ڕێگەی والی سنە (فەرهاد میرزا)، کە مامی (ناسرەدین شا)ی ئێران بووەو والی (سنە)ش بووە لەساڵی(1867 ـ 1874ز)، داوای لە محەمەد پاشا کرد کە هۆزی جاف نیشتەجێ بکاتو ببنە شوێنکەوتەی ئێران، بەڵام حەمە پاشا بەم داوا کاریە ڕازی نەبوو بەوەش پەیوەندیەکانیان لەگەڵ ئێران تێکچوو[6]، لەو کاتەشدا (محمود پاشا)ی کوڕی لە بەغداد نیشتەجێ بووبوو، زەوی وزارێکی زۆری لە قەزای (خانەقینو کفری) کڕی بوو[7]. والی بەغدا (تەحسین پاشا) بۆ گەڕانەوەی حەمە پاشا بۆ ناوچەی سلێمانی هەوڵێکی زۆریدا لەو پێناوەشدا سێ جار (مەحمود بەگی) کوڕی دەنێرێت بەدوایدا، لە کۆتایدا بۆ قایمقامێتی هەڵەبجەو سەرۆکایەتی جاف هەندێ زەویو زارو موڵك فەرمانی بۆ دێ، حەمە پاشاش دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی سلێمانی، حەمە پاشا تا ساڵی (1299ك ـ 1881ز) بەم شێوەیە دەوامی کرد[8]. بۆچوونێکی تر دەڵێت: لەسەرەتای گەڕانەوەیدا

---

[1] ـ کەریم بەگی فەتاح بەگ: سەرچاوەی پێشوو، ل172.

[2] ـ حەسەن فەهمی جاف: مێژووی هۆزی جافو مەحمود پاشای جاف، چاپخانەی (دێکان)، 1999، ل36.

[3] ـ کەریم بەگی فەتاح بەگ: سەرچاوەی پێشوو، ل176.

[4] ـ د. حەسەن جاف: با وردتر لە ڕووداوە مێژووییەکان بکۆڵینەوە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژ (116)، بەغدا، 1987، ل44.

[5] ـ بەوەرگرتن لە: ئومێد ئاشنا: مەحمود پاشای جاف (1846 – 1921)، چاپخانەی بینایی، 1999، ل24.

[6] ـ هەمان سەرچاوە، ل43.

[7] ـ محەمەد ئەمین زەکی بەگ: تاریخی سلێمانی وە ولاتی، ب3، چ2، چاپخانەی (شڤان)، سلێمانی، 2006، ل133.

[8] ـ هەمان سەرچاوە، ل133.

کراوە بە جێگری موتەسەریفی سلێمانیو لەدواتردا کراوە بە قایمقامی هەڵەبجە، هەروەك پێشتر ئاماژەی پێکرا پێدەچێت کە ئەم یەکەمین قایمقامی هەڵەبجە بێت .

دەوڵەتی عوسمانی بۆ ڕاکێشانی محەمەد پاشا نازناوی پاشایەتی پێبەخشی، بەڵام درانی ئەم نازناوە بە حەمە پاشا ئەوی لە بیری سەربەخۆیی هۆزی جاف نەهێنایە خوارەوە. پاشا هەوڵیداوە ڕیزەکانی ئێلی جاف توندوتۆڵتر بکات تا بە سەربەخۆیی بژین.

والی بەغدا لەسەرەتاوە وای بەباش زانی ڕێزێکی زۆر لە محەمەد پاشا بگرێت، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەبوو کە زۆربەی کاربەدەستانی دەوڵەی عوسمانی لێی دڵگیربوونو زۆریان ڕق لیّ دەبووەوە، هاتنەوەیان بە هەل زانیووە بۆ ئەوەی لەناوی بەرن. لەسەرەتادا بۆ ئەوەی بەدگومانی حەمە پاشا نەوروژێنن کردوویانە بە جێگری موتەسەریفی سلێمانی، پاش ماوەیەك دەیکەن بە قایمقامی هەڵەبجە .

تیرەی شاتری، کە تیرەیەکە لە جاف ئەمانەش لەناو خۆیاندا لەم تیرانە پێکهاتوون: (هۆزی برایم، کەرەم وەیسی، میروەیسی، وردەشاتری، یوسوجانی). تیرەی کەرەم وەیسی کە تیرەیەکی چاوقایمو ژمارەشیان زۆر بووەو زۆریش دەوڵەمەند بوون، لە پێشتردا لەگەڵ حەمە پاشا نەڕۆشتوون بۆ ئێران، بە هەموو هێزێکیانەوە دوژمنایەتی حەمە پاشایان دەکرد. کاتێك حەمە پاشا لە ئێران بوو، ئەمان خۆیان لە حکومەتی عوسمانی نزیك کردەوە ، سەرۆکی ئەم تیرەیە (عەزیز شاوەیس) بوو . دەوڵەتی عوسمانی: موڵکێکی زۆری بەم تیرەیە بەخشیبوو. پاش دانانی حەمە پاشا بە قایمقامی هەڵەبجە، حکومەتی عوسمانی هانی ئەم تیرەیەی دەدا کە دژی حەمە پاشا بجووڵێنەوە . هاندانیان گەشتە ڕادەیەك (عەزیز شاوەیس)، ڕێگای بە پیاوەکانی حەمە پاشا نەدەدا کە کاروباری ڕەسمی قایمقامی هەڵەبجە بەڕێوەبەرن. (عەزیز شاوەیس) ماڵی لە گوندی بەشارەت بوو، کە نزیکەی (7 – 8)کم لە قەزای هەڵەبجەوە دوورە، بۆیە حەمە پاشا ناردی بە شوێن (عەزیز شاوەیس)دا، بەڵام (عەزیز شاوەیس) گوێی بەو بانگکردنەی نەدا، تا سەرەنجام لە هەلێکدا (عەزین) لەلایەن حەمە پاشاوە دەستگیرکراو خرایە بەندیخانەی هەڵەبجەوە، (شاوەیس) ماوەیەکی زۆرلە بەندیخانە مایەوە، پاش ماوەیەك لە بەندیخانەدا بە نەخۆشی سیل دەمرێت.

کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانیو هەندیّ لە دوژمنانی حەمە پاشاو هۆزی جاف ئەمەیان بەهەل زانیو پروپاگەندەی زۆریان دژی پاشا بڵاو کردەوە، نەیارەکانی پاشاو هۆزی جاف لەم هەوڵەیاندا سەرکەوتن، تیرەی (کەرەم وەیسی) ولیان

---

1 - فەیروز حەسەن: سەرچاوەی پێشوو، ل2.

2 - کەریم بەگی فەتاح بەگ: سەرچاوەی پێشوو، ل50.

3 - - بەکر حەمەصدیق عارف: هەڵەبجە قوربانی ڕقی تۆڵەکردنەوە لە مێژوودا، گۆڤاری (هەڵە بجە)، 2002، ل64.

4 - کەریم بەگی فەتاح بەگ: سەرچاوەی پێشوو، ل57.

5 - حەسەن فەهمی: سەرچاوەی پێشوو، ل41.

6 - هەمان سەرچاوە، ل41.

* ئەو کابرا جافەی کە حەمە پاشای جاف کوشت، بە تفەنگێکەوە دەڕواتە ئەو خێوەتەی کە حەمە پاشا بە تەنها تیایدا دانیشتووە، حەمە پاشا کاتێك چاوی بەو کابرایە کەوت بەو شێوەیە پێی وت: دەویت باوك، باوکت بە گاڵۆکەوە نەهاتۆتە ژوورەوە ئێستە تۆ بە تفەنگەوە دێیت؟ ئەویش ئەڵێ: پاشا! باوکم باوکی نەکوژریاگە، من باوکم کوژریاگە! ئەمە دەڵیّو تەقەی لیّ دەکاتو دەیکوژیّ. (عەلادین سەجادی: ڕشتەی مرواری، ب6، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، 2005، ل248.)

6 - د. حەسەن جاف: با وردتر لە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نویّ)، ژ (116)، ل45.

7 - د. حەسەن جاف: با وردتر لە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نویّ)، ژ (116)، 1987، ل45.

گومان برد کە سەرۆکی تیرەکەیان دەرمان خوارد کراوە. کەرەم وەیسی یەکان ئەمەیان لەدڵ گرتو بەشوێن هەلێکدا دەگەڕان کە حەمە پاشا لەناو بەرن، بۆیە کاتێك حەمە پاشا لە ساڵی (1299 ـ 1881ز) لە ناوچەی (چیمەنی برایم سەمین)ی نزیك کفری خەریکی ڕاوکردن دەبێ دەیکوژن*[1].

محەمەد ئەمین زەکی بەگ دەڵێت: "فیرقەیەکی شاتری، کەبەعزێ لە پیاوەکانیان لەحەپسی محەمەد پاشادا مردبوون، ئەچنە سەری ئەیکوژنو ڕائەکەنە لای جوامێری هەمەوەند. مەحمود بەگ بۆ سەندنی خوێنی باوکی لەشکر ئەکاو بەشوێن جوامێرو شاتری دا تائێران ئەچیو بەعزێ لەهەمەوەدو هەموو پیاوی بەکاری شاتری لەناو ئەبا"[2].

## دووەم: هەڵەبجە لەسەردەمی مەحمود پاشای جافدا

دوای حەمە پاشا[3]ی جاف، مەحمود پاشای جاف کوڕە گەورەکەی (1846 ـ 1921)و دۆستی نزیکی مەولەوی شاعیر دەبێتە قایمقامی هەڵەبجەو سەرۆکی هۆزی جاف[4]، لە مێژووی (1881)دا (مەحمود پاشا)[5] بوو بە سەرۆکی جافـو بەگزادەو قایمقامی هەڵەبجە[6]. دەوڵەتی عوسمانی، پلەی (بەگلەر بەگی) لەگەڵ پلەی (پاشا)یەتی پێ بەخشی، جگەلەوەش دانیان بەمەحمود پاشا دانا وەك سەرۆکی عەشیرەتی جاف[7]. حکومەتی ئێرانیش هەمیشە دڵنەوایی دەکردو دەیویست پەیوەندی لەگەڵدا دامەزرێنێت، تەنانەت شای ئێرانی شێرێکی جەواهیرنیشانی خەڵات کردو نیشانەو مەدالیایەکی زۆری پێ بەخشی لەگەڵ پلەی(خان)یەتییەتیدا[8].

(زێوەر)یش، ئەڵێت:"ئەم زاتە دوو دەفعە لەتەرەفی سوڵتان عەبولحەمیدەوە تەکلیفی وەزیری لێکرا قبوڵی نەکرد، مانگی پەنجا لیرەی لەتەرەف حکوومەتەوە هەبوو. ئەو مەعاشەی بۆ تەحسین کرابوو کەئیتاعە بەحکوومەت بکا"[9].

پاشاکانی جاف زۆر بەڕێزو بەرز بوون، وبەشێوەیەکی گشتیش کەم دوو بوون، هەر بڕیارێکیان بدایە دەست بەجێ جێبەجێیان دەکرد، بۆ ئەوەش دوبەرەکی نەکەوێتە ناو عەشیرەتەکەیانەوە هەر کارێك پێویست بوو بێ کردوویانە[10].

زێوەر لە جێگایەکی تردا لەباسی مەحمود پاشادا دەڵێتت:"لە کاتێکدا کە مەحمود پاشا قایمقامی هەڵەبجە ئەبێتو دەسەڵاتێکی زۆری لەکوردستاندا دەبێت، پەیوەندی لەگەڵ سەرۆك عەشیرەتەکانی ئێرانو عێراقدا پەیدا دەکات. لە قزراباتەوە هەتا مەریوان، ئەو دێیانەی قەڵەمڕەوی جاف بوو، مەعاشی بۆ مەلا، وەقف بۆ مزگەوتەکانیان لەتەرەف پاشاوە مەعلوم کرابوو. لە نەفسی سولەیمانیدا هەموو مەلاو مودەڕریسو زۆر لە ساحێب خانەدانی لێقەوماو مووچەو بەراتیان

---

[1] ـ د. حەسەن جاف: با وردتر لە، گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)، ژ (116)، ل45.

[2] ـ تاریخی سلێمانی، ب3، چ2، ل133.

[3] ـ حەمە پاشا حەوت کوڕی هەبووە: مەحمود پاشاو وەسمان پاشا کە هەردوکیان برای دایکیو باوکی بوون، محەمەد عەلی بەگ، سلێمان بەگ، حەسەن بەگ، فەتاح بەگ، جگە لە قادر بەگ شەش لەو کوڕانە نەوەو نەتەوەیان هەبووە. (حەسەن فەهمی: سەرچاوەی پێشوو، ل52).

[4] ـ فەیروز حەسەن: سەرچاوەی پێشوو، ل2.

[5] بە هەمان شێوە هەندێك لە مێژوونووسان مەحمود پاشا وەك قایمقامی هەڵەبجە ناناسێنن، بەڵکو وەسمان پاشای برای وەك یەکەم قایمقامی هەڵەبجە دەناسێنن.

[6] ـ کەریم بەگی فەتاح بەگ: سەرچاوەی پێشوو، ل186.

[7] ـ د. محمد علی الصیورکي: معجم اعلام الکرد في التأریخ الاسلامي والعصر الحدیث في کردستان وخارجها، سلێمانی، 2006، ص684ـ685.

[8] ـ حەسەن فەهمی جاف: مێژووی هۆزی جافـو مەحمود پاشای جاف، ل37.

[9] ـ گەنجینەی مەردانو یادداشتی ڕۆژانی دەربەدەری، چاپخانەی (الأدیب)، بغداد، 1985، ل70.

[10] ـ حەسەن فەهمی: سەرچاوەی پێشوو، ل24.

هەبوو لای پاشا. مەدرەسەیەکی لەقزرابات کردەوە وەك مەدرەسەی (نیزامیەی نیزامولمولك) دەبوو، هەموو مانگێ جرلیرە زیاتر بۆ مەعاشی مودەرریسو تەلەبەو موئەززینو خادیم لەوەقفێ کەبۆی داناوە، سەرف ئەکرێ"[1].

شێخ ڕەزای شاعیریش لە مەدحی مەحمود پاشادا دەڵێت:

بەمەحمودی مراروی نیازانست

کە صد مەحمود در پیشنش ایازانست[2]

زیرەکیو هۆشیاری مەحمود پاشا لەلایەن ئەو مێژوونوسانەی کەباسیان کردووە بەئاشکرا پەنجەی بۆ ڕاکێشراوەو دانیان پیادا ناوە[3].

(مێجەرسون)یش، باس لەوەکات کە ژمارەی سوارەکانی مەحمود پاشاو مەجید بەگی نوێنەری وەسمان پاشای برایو محەمەد عەلی بەگی برای لە (4000) هەزار سوارە زیاتر بوون، ئەمانە هەموویان بە تفەنگی مارتینی چەکدار کرا بوون، لەچەند کاتژمێرێکدا دەیانتوانی لەژێر دەسەڵاتی سەرۆکەکانیاندا بۆ جەنگ ئامادەبن[4].

ئەو خزمەتانەی کە (مەحمود پاشا) پێشکەشی نەتەوەکەی خۆی کردووە، ڕاستی دڵسۆزی (مەحمود پاشا) دەسەلمێنێ، لەلایەکی ترەوە پاشا تەنها بەرپرسیارو سەرۆك هۆزێکی گەورەی کورد نەبووە، بەڵکو خۆی بە بەرپرسیارو خزمەتگوزارێکی نەتەوەکەی زانییوە[5]. بەتایبەتی کە چەند جارێك سەری لە مەڵبەندە گەورەکانی ئەوسەردەمە داوە، وەك ئەستەمبوڵو ڕوسیای ئەوکاتەو بەغداو گەلێ شوێنی شارستانی، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا بیری نەتەوەیی ئەوی فراوانو پتەوتر کرد[6]. مەحمود پاشا لە ساڵی (1304ك / 1886ز) دەیویست حکومەتێکی کوردی دروست بکات[7].

لە شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای شەمزینیدا، هۆزی جاف لەگەڵ هۆزی (کاروبکو شکاك)دا بە (50) هەزار تفەنگ[8] بەشدارییان کرد[9]، جاری دووەم کە هێزەکانی ڕووسیا لە ئێرانەوە پەلاماری عوسمانییەکانیاندا گەشتنە سەقزو بانە، حکومەتی عوسمانی داوای لە مەحمود پاشاو سەرۆکەکانی تری کورد کرد، کە بۆ جیهادکردن بڕۆنو یارمەتییان بدەن دژی ڕووس. لە بەگزادەکانی جاف (تاهیر بەگی عوسمان پاشا، شاعیری بەناوبانگ لەگەڵ عەلی بەگی[10] مەحمود پاشاو حسێن بەگی ئەحمەد بەگی حەمەبەگی وەڵەدبەگی) ڕۆشتن، ئەو شەڕە لە ناوچەی (قوری مەحاڵی سەقز) بوو. چەند بەگزادەیەکی تر بە خۆیانو دەستو پێوەندەکانیانەوە لە سەقزو بۆکانەوە بەشداری ئەو شەڕەیان کرد[11].

---

[1] ـ گەنجینەی مەردانو، ل72، 76ـ77.

[2] ـ هەمان سەرچاوە، ل78.

[3] د. حەسەن جاف: چەمکێك لە ژیانی مەحمود پاشای جاف (1846 – 1921ز)، گۆڤاری (نەوشەفەق)، ژ (39)، 2006، ل20.

[4] ـ رحلة متنكرة الى بلاد، ج1، ص278.

[5] ـ ئومێد ئاشنا: سەرچاوەی پێشوو، ل23.

[6] هەمان سەرچاوە، ل24.

[7] ـ جەمال بابانو ئەوانی تر: سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ب2، ل290.

[8] پێموایە ئەم ژمارەیە زیادەڕۆیی تێداکراوە، نووسەر.

[9] ـ ئومێد ئاشنا: سەرچاوەی پێشوو، ل27.

[10] ـ ئومێد ئاشنا، بە هەڵە عەلی بەگی بە کوڕی وەسمان پاشا داناوە، لە کاتێکدا عەلی بەگ کوڕی مەحمود پاشایە.

[11] ـ ئومێد ئاشنا: سەرچاوەی پێشوو، ل27ـ28.

جێگای ئاماژە پێکردنە، مەحمود پاشا لە ساڵی (1895) لە کاتی کوشتاری ئەرمەنەکاندا ڕێگەی نەدا بە پیاوەکانی لەو کوشتارەدا بەشداری بکەن، لەبەر ئەوە ئەرمەنەکان بە چاوی ڕێزو خۆشەوستییەوە تێی دەڕوانن[1] . هەروەها مەحمود پاشا بە هەموو شێوەیەك دژی سوارەی حەمیدی بوو، ئەم هەڵوێستەش سوڵتان (عەبدولحەمیدی) تورەو بێزار کردبوو.

هەروەك پێشتر باسمانکرد، پاش کوژرانی حەمە پاشای باوکی لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە وەك قایمقامی هەڵەبجەو سەرۆکی هۆزی جاف ناسێنرا، بەڵام دواتر کەوتنە هەوڵی ئەوەی کە لە دەسەڵاتی کەم بکەنەوەو لەناو هۆزەکەیدا لاوازی بکەن. بۆ ئەو مەبەستەش ناکۆکی زۆریان خستە نێوان خۆیو براکانییەوە بە تایبەتی عوسمان پاشا[2] ، کە دوو ساڵ لەو بچووکتر بوو. هەوڵێکی بەرچاویاندا بۆ ئەوەی بەهۆی عوسمان پاشاوە سەرۆك جافەکانی لێ دووربخەنەوە[3] . بەڵام مەحمود پاشا کەسایەتییەکی هەڵکەوتوو بوو، ئەو جۆرە پیلانانە نەیاندەتوانی مەحمود پاشا لە جووڵانەوەو دژایەتی عوسمانییەکان ڕابگرێت.

حکومەتی عوسمانی، یەکجار لە پەرەسەندنی دەسەڵاتی مەحمود پاشا لە باشووری کوردستاندا نارەحەتو نیگەران بوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی ژمارەیەك لە دوژمنانی دەسەڵاتی مەحمود پاشا هەمیشە راپۆرتیان لە دژی ئەو گەیاندووەتە حکومەتی عوسمانیو کاربەدەستانی، هەمیشە بۆهەلێك گەڕاون تا بتوانن مەحمود پاشا لە قایمقامێتی هەڵەبجەو سەرۆکایەتی هۆزی جاف لابەرنو لە ناوچەکە دووری بخەنەوە[4] . مەحمود پاشاش لای خۆیەوە هەوڵی دەدا نیشتمان پەروەرو نەتەوەپەروەرەکانی دەوروپشتی خۆی هانبدا بۆ ڕاپەڕین دژی دەوڵەتی عوسمانی[5] ، (ئەمین زەکی بەگی)یش، باس لەوە دەکات کە لەم دواییانەدا مەحمود پاشا هەندێ تۆمەتی نەتەوەخوازی دراوەتە پاڵ، لەم بارەشەوە دەوڵەتی عوسمانی دڵی لێکرمێ بووبوو[6] .

لە ڕاستیدا مەحمود پاشای جاف هەمیشە لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانیدا لەکێشەو ململانێدا بووەو دانویان بەیەکەوە نەدەکولا[7] .

هەروەك پێشتر باسمان لێوەکرد، مەحمود پاشا لە ساڵی (1301ك / 1883ز) لەلایەن سوڵتان (عەبدولحەمید)ەوە پلەی (میری میران)ی بۆ هات، کە لەو کاتەدا پاشا قایمقامی هەڵەبجە بوو، عوسمان پاشای براشی بەسەر (پشتماڵە)وە بوو، ئیدارەی هەموو جاف دەکرد[8] . لە ساڵی (1307ك) کە (نامیق بەگ)ی میر ئالای بۆ ڕێکخستنی زەویو زاری شارەزوور هاتە ناوچەکە، عوسمان بەگی برای مەحمود پاشا خزمەتی زۆری کرد کە ئەوکات لە ناوچەی (زەڵم) بوو، بەڵام مەحمود پاشا زۆر بایەخی بە (نامیق بەگ) نەدا. لەسەر تەلەگرافی (نامیق بەگ) کە بۆ ئەستەمبوڵی ناردبوو، قایمقامی هەڵەبجەو پایەی (میری میران) درا بە عوسمان پاشاو مەحمود پاشاش کرا بە موتەسەریفی شاری (ئورفە)[9] .

---

[1] ـ د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد, ب1, چاپخانەی(الادیب), بەغداد, 1985, ل54.

[2] ـ د. عیزەدین مستەفا ڕەسولْ, پێی وایە هیچ بەڵگەیەك لەبەردەستدا نییە کە ناکۆکی نێوان ئەو دوو برایە بسەلمێنێ. (تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان, بەرنامەیەکی تایبەت هەڵەبجە, 2006/3/16)

[3] ـ د. حەسەن جاف: چەمکێك لە, گۆڤاری(نەوشەفەق, ژ(39), ل22.

[4] ـ هەمان سەرچاوە, ل22، د. حەسەن جاف: وێنەیەکی یادگاریو هەڵوێستێکی مەردانەی مەحمود پاشای جاف , گۆڤاری( ڕەنگین), ژ(52), 1993, ل23.

[5] ـ د. حەسەن جاف: وێنەیەکی یادگاریو هەڵوێستێکی مەردانەی مەحمود پاشای جاف, گۆڤاری( ڕەنگین), ژ(52), 1993, ل23.

[6] ـ د. حەسەن جاف: چەمکێك لە, گۆڤاری (نەوشەفەق), ژ(39), ل 21

[7] ـ د. حەسەن جاف: وێنەیەکی یادگاری و , ل23.

[8] ـ کەریم بەگی فەتاح بەگ: سەرچاوەی پێشوو, ل186ـ187.

[9] ـ محەمەد ئەمین زەکی بەگ: تاریخی سلێمانی, ب3, چ3, ل133.

مەحمود پاشا دوای ئەو بڕیارە ماوەی چوار مانگ لە هەڵەبجە مایەوە، عوسمان پاشا لەو ماوەیەدا کەمتر دەستی لە کاروباری ئیداری قەزاکە وەردەدا[1] . مەحمود پاشا لە ماوەی ئەو چوار مانگەدا هەرنامەیەکی ڕەسمی بۆ بهاتایە بە ناوی موتەسەریفی (ئورفە)وە بۆی دەهات[2] . مەحمود پاشا لە بەهاری ئەو ساڵەدا لەگەڵ محەمەدعەلی بەگی برایدا ڕۆیشت بۆ ئەستەمبوڵ بۆ لای سوڵتان عەبدولحەمید، کاتێك مەحمود پاشا گەیشتە ئەستەمبوڵ، سوڵتان بە ئاسانی ڕێگەی نەدا کە بگەڕێتەوە، بۆیە دوو ساڵ لەوێ مایەوە[3] ، دواتر لە هەلێکدا کە بۆی هەڵکەوت بە دزییەوە خۆی گەیاندە ڕووسیا(شاری باکۆ ـ نوسەر)[4] ، لەوێ نامەیەکی تایبەتی بەپۆستەدا نارد بۆ سوڵتان عەبدولحەمید کەتیایدا دەڵێت:"تۆ ستەمکارو خوێنڕێژیو لەخوا ناترسی، هیچ سەرم سوڕنامێنی کە ئەم ستەمو ڕەفتارە ناشیرینانەت هەبێ، چونکە زۆڵو حەرام زادەیتو کوڕی عەبدولمەجید نیت[5] ، تۆ سوڵتانی جائری، سوڵتانی جائریش بەگوێرەی شەرعی ئیسلام واجب الاطاعة نییە تۆ پیاوێکی پیری، کەچی (300) ژنی پیێ زانراوت هەن، ئەمەش لەتەك شەریعەتی ئیسلامو ڕەوشتی مرۆڤایەتیدا یەك ناگرێتەوە"[6] ، دواتر لەوێشەوە خۆی گەیاندە شاری (ڕەشت)، لەوێشەوە گەڕایەوە ناو جاف. بەڵام زۆری نەبرد نزیکەی (2000) دوو هەزار سەربازی پیادەی عوسمانی ڕوویان کردە هەڵەبجە بۆ گرتنی مەحمود پاشا، کەچی نەیانتوانی مەحمود پاشا بگرن. لە دواییدا مەحمود پاشا ڕۆیشت بۆ بەغداد بۆ ئەوەی والی داوای لێخۆشبوونی بۆ بکات لای سوڵتان، بە گەشتنی پاشا بۆ بەغدا، ناچارکرا خۆی بڕوات بۆ لای سوڵتان بۆ ئەستەمبوڵ، مەحمود پاشاش بەنیازی ڕۆشتن بۆ ئەستەمبوڵ بەغدادی بەجێهێشت، لەگەڵ کۆمەڵێك سەرباز بۆ چاودێری کردنی، کاتێك گەشتنە ناوچەی (قەرەتەپە) هێزێکی جاف کە پێشتر ئامادەکرابوو مەحمود پاشایان ڕزگارکرد، ڕوویانکردە (کانی چەقەڵ)، لە کاردانەوەی ئەم کارەدا سەرلەنوێ هێزێکی سەربازی نێردرا بۆ گرتنی مەحمود پاشا، پاشاش بە ناچاری ڕوویکردە شاخی (زمناکۆ)* . لە پاش ماوەیەك لەسەر خواستی خۆی لەگەڵ (عەلی بەگ)[7]ی کوڕیدا جارێکی تر ڕۆیشتەوە بۆ ئەستەمبوڵ، پاش ساڵێك مانەوە لە ئەستەمبوڵ (15) پانزە (موقاتەعەی) لە قەزای کفریو سلێمانی پێدراو گەڕێنرایەوە جێگای خۆی، تا ساڵی (1339ك / 1921ز) پاشا لە شاری هەڵەبجە کۆچی دوایی کردو، لە قزراباتو لەو مزگەوتەی کە خۆی دروستی کردبوو بەخاك سپێردرا[8] .

بەبۆنەی مردنی مەحمود پاشای جافەوە، (سێرپرسی کۆکس) حاکمی مەدەنی عێراق، پرسەنامەیەکی ئاڕاستەی سەردارەکانی جاف کردووە، لەو نامەیەدا کۆکس دڵگرانی خۆی بەهۆی مردنی مەحمود پاشا دەربڕیوە، پرسەو سەرەخۆشی لەبەگزادەکانی جاف وعەشیرەتی جاف کردووەو هاوخەمی خۆی بۆخێزانو کەسوکارەکەی نیشانداوە .

---

[1] ـ کەریم بەگی فەتاح بەگ: سەرچاوەی پێشوو، ل188.

[2] ـ هەمان سەرچاوە,ل68.

[3] ـ کەریم بەگی فەتاح بەگ: سەرچاوەی پێشوو، ل188.

[4] ـ محەمەدئەمین زەکی بەگ: تاریخی سلێمانی, ب3, چ3, ل133ـ134 .

[5] ـ سوڵتان عەبدولحەمید لە1842/9/22 لە کەنیزەکێکی چەرکەسی سوڵتان عەبدولمەجید کەناوی (تیری موژگان) بووە لەدایك بووە. لەیەکەم ڕۆژی لەدایکبونییەوە پڕوپاگەندەیان بۆ دایکی کرد کە گوایە لە عەبدولمەجید نیە, بەڵکو لەخزمەتکاریکی ئەرمەنیە, کەئاشپەزی کۆشکی عەبدولمەجید بووە, بەلام ڕاستیەکەی ئەم پڕوپاگەندەیە زۆر دوورە لە ڕاستیەوەو دوژمنانی ئەو تۆمەتەیان بۆ هەڵبەستبوو. ( کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف: سەرچاوەی پێشوو,ل70 , پ110 )

[6] ـ د. حەسەن جاف : وێنەیەکی یادگاریو, گۆڤاری(ڕەنگین), ژ(52),ل23

*ـ زمناکۆ چیایەکە دەکەوێتە ناوچەی شەمێران, لە ڕۆژئاوای شاری هەڵەبجە .

[7] ـ نووسەر بە هەڵە نوسیویەتی (حەمەعلی بەگ) برای بووە,( بڕوانە تەئریخی جاف,ل195)

[8] ـ ڕۆژنامەی پێشکەوتن, ژ(54), 1921/5/5 .

له دوای مردنی مەحمود پاشا[1] له ساڵی 1921، یەکێك له کوڕەکانی به ناوی (عەلی بەگ) بوو به سەرۆکی جافه خێڵ نشینەکان، بەڵام جێگری حاکمی سیاسی هەڵەبجه (لین)، ئەوی لەبەر لێنەهاتوویی بۆ ئەو کاره لابردو کەریم بەگی برازای مەحمود پاشاو عوسمان پاشای که له پلەیەکی نزمتردا بوو له جێگەی ئەو دانا[2]. کەریم بەگ پیاوێکی خاوەن دەسەڵاتو دیوەخان بوو. تا له ساڵی (1925)دا بەیەکجاری سەرۆکایەتی عەشیرەتی جاف هەڵوەشێنرایەوە[3]. بەمجۆره یەکێتیو هاوکاری جاف بەیەکجاری براو تێکچوو[4].

## سێیەم: هەڵەبجه له سەردەمی عوسمان پاشای جافدا (1889 –1909ز)

عوسمان پاشا کوڕی محەمەد پاشا کوڕی کەیخەسرەو بەگی کوڕی سلێمان بەگی کوڕی زاهیر بەگە، له پیاوە ئیدارییەکانی عوسمانییەو یەکێکە له سەرۆك عەشیرەتەکانی جاف، له ناوچەکانی سلێمانیو ئەردەڵاندا دەسەڵاتی هەبووە[5]، ساڵی 1847 لەدایك بووە، حکومەتی ئێرانی له ساڵی 1873 کردوویەتی به فەرمانڕەوای جوانڕۆو زەهاو، پاشان بەپێی پەیمانێك که لەگەڵ حکومەتی عوسمانی مۆریان کرد لەگەڵ باوکیو عەشیرەتەکەی گەڕانەوە بۆ ناو دەوڵەتی عوسمانی (1877ز).

پاش گەڕانەوەیان، حەمە پاشا کرا به قایمقامی هەڵەبجەو عوسمان بەگی کوڕیشی کرا به یاریدەدەری تاساڵی (1881ز) که باوکی کوژرا.[6] مردنی حەمە پاشا بووە هۆی دابەشکردنی هۆزەکەی، مەحمود پاشا سەرپەرشتی هۆزەکانی کۆچەری گرتە ئەستۆ له کۆچکردنی بەهارانو پایزاندا له نێوان بەرزاییو دۆڵەکانی هەڵەبجەو دەشتی شارەزووردا بەشداری دەکرد، عوسمان پاشاش دەستی بەسەر جولامبارو زەوییەکانی شارەزووردا گرتو فەرمانڕەوایی ناوچەکەشی بۆ خۆی تەرخانکردبوو، بەڵام سێیەم کوڕی (محەمەد عەلی) له قزرابات ( سەعدییەی ئێستا) مایەوەو زەویو زارو باخەکانی ئەو ناوچەیەی بەڕێوە دەبرد[7]. وەسمان پاشا پیاوێکی زۆر به ئایینو چاکەکار بووە، زمانی شیرینو کۆڕ گەرمو دەستو دڵ فراوان بووە[8].

زێوەری شاعیر دەڵێت: "بەڕاستی دیوەخانو نانوخوانی عوسمان پاشا خوانی (بەغما) بووە، نەك به خسوسی، به دائیمی وابووە. بۆ تەعمیری مزگەوتی گەورە له سلێمانی که له زەمانی بابانەکانەوە دروستکرابوو، ڕوو له خراپ بوون بوو، به جارێ (500) لیرەی عوسمانی نارد که سەرفی تەعمیراتی بکەن، هەروەها بۆ عولەمای هەڵەبجەو ئەتراف ئیحسانی دەوامی ئەکرد[9]، تەبیعەتی ئەوەندە بەرز بوو که بهاتایە سولەیمانی میوانی کەس نەدەبوو، خانووی خسوسی ئەگرت.

---

[1] ـ مەحمود پاشا چوار کوڕی هەبووە ئەوانیش (کەیخەسرەو بەگ, عەلی بەگ, حسەین بەگ, ئەحمەد بەگ.( کەریم بەگی فەتاح بەگ: سەرچاوەی پێشوو، ل197)

[2] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو، ل201.

[3] ـ جەمال بابان: سلێمانی شاره گەشاوەکەم, ب2, ل26.

[4] ـ مەحمود عەزیز حسەین: کورتەیەك له مێژووی هۆزی جافو باسی هەندێك لەتیرەکانی, چاپخانەی( نەورەس), سلێمانی, 1985ل27.

[5] ـ د. محمد علی الصویرکی: مصدرالسابق, ص445.

[6] ـ میربەسری: سەرچاوەی پێشوو,ل 140.

[7] ـ عەبدواکەریم حەمید: سەرچاوەی پێشوو، ل13ـ14.

[8] ـ حەسەن فەهمی: سەرچاوەی پێشوو، ل53.

[9] ـ عەلادین سەجادی دەڵێت: ( مەلاعەبدولڕەحیمی چڕۆسانی, مەلای حسێن بەگی جاف بوو, له ئاوایی (فەقێ جنه) حسێن بەگ هەموو هەفتەیەك موچەی بۆ فەقێکان بڕیبووەوە. هەفتەیەکیان لەناردنەکەی دواکەوتبوو, فەقێکانیش بەمەلا دەڵێن, مەلاش دەڕواتە لای حسێن بەگو پێیدەڵێ: حسێن بەگ, ئەگەر پیاوی وەکو پاشابە(مەبەستی عوسمان پاشابووە), ئەگەر ژنی وەکو خانم به (مەبەستی عادیلەخان بووە), ئەگەرنا نەپیاوی

هەروەك هەڵەبجە ئەهلی سولەیمانیو مەئموران ئەچوونە دیوەخانەکەی". [1] دەسەڵاتی ئەم بنەماڵەیە وەکو سەرۆك هۆزو سەرۆکی یەکەی ئیداری هاندەرێکی گەورە بووە لە نیشتەجێ بوونی تیرەکانی جاف لە شاری هەڵەبجەو دەوروبەریدا . [2]

وەسمان پاشا دەستی گرت بەسەر زەوییەکانی ناوچەی هەڵەبجەو خورماڵو شارەزووردا، بەهۆی پەرەسەندنی هێزو سامانییەوە توانی فەرمانڕەوایی ئەو ناوچەیە بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی . [3] وەسمان پاشا هەمیشە لە شارەزووردا دەمایەوەو نزیکەی هەموو موڵکی قەزای گوڵعەنبەر (هەڵەبجە) موڵکی ئەو بوو . [4]

هەروەك پێشتر باسمان لێوەکرد، لە ساڵی (1889) لەسەر تەلەگرافەکەی (نامیق بەگ)کرا بە قایمقامی هەڵەبجە [5] تا ئەوەی لە ساڵی (1889ز) هەردوو پایەی قایمقامی هەڵەبجەو میری میرانی لە جێگای براکەی وەرگرت، نزیکەی (20) ساڵ بەو ئەرکە هەڵسا . [6]

بەپێچەوانەی بۆچوونی ئەو نوسەرانەی کەپێیان وایە حەمە پاشای باوکی عوسمان پاشا یەکەم قایمقامی هەڵەبجەیە، هەندێك لەنوسەرانو مێژوونوسان پێیان وایە کە هەڵەبجە بۆ یەکەمجار لە ساڵی1889ز و لەلایەن دەوڵەتی عوسمانیەوە لەگەڵ شاری( نەجەف) بە یەك رۆژو بە یەك فەرمان، بڕیاری بە قەزابوونیان بۆ دەرچووە، بەپێی ئەم بۆچونەش بێت عوسمان پاشا دەبێتە یەکەم قایمقامی هەڵەبجە نەك حەمە پاشای باوکی.

عوسمان پاشا لەگەڵ ئەوەی پیاوێکی دیندارو چاکەکار بووە، لەهەڵسوکەوتیشدا نەرمونیانو بەخشندە بووە. هەڵەبجەی بە خزمەتگوزارییەکانی ئاوەدانکردەوە تا ئێستاش شوێنەواری ئەو خزمەتانەی دیارەو گەواهی لەسەر هەوڵو کۆششەکانی ئەو پیاوە دەدەن. دوای ئەوەی حکومەتی عوسمانی پلەی (میری میران)ی پێ بەخشی، حکومەتی ئێرانیش دیاری نایابو بەنرخی پێشکەش کردووە. عوسمان پاشا دەسەڵاتی گەورەی هەبوو لە ناوچەکانی سلێمانی (بابان)و ئەردەڵاندا [7]. زۆربەی کات لە سەفەرو هاتوچۆی ئەملاولادا بووەو بە کەمی لە بارەگاو مەڵبەندی خۆی (هەڵەبجە) ئەمایەوە، هەر بۆیە زۆربەی دەسەڵاتەکەی کەوتبووە دەست خێزانەکەی (عادیلەخانم) [8] ، لەبەر سەرقاڵی زۆری پاشاو ناوبەناو سەفەرکردنی بۆ موصڵو کەرکوکو سلێمانی بۆ هەندێ کاروباری گرنگ، لەم کاتانەدا (عادیلەخانم)ی خێزانی دەبوو بە جێگریو فەرمانڕەوایی دەکرد . [9]

وەسمان پاشا [10] زیاتر لە هەرکەسێکی تری ئەو بنەماڵەیە رۆڵی هەبووە لە گۆڕینی هەڵەبجە لە شارۆچکەیەکەوە بۆ شارێك بە پێوەندگی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمو سەرەتای سەدەی بیستەم، شوێنەوارە بەجێماوەکانی بەڵگەن بۆ ئەم

---

نەژنی, نەمەدرەسە ڕاگرە ونەفەقێش دەسخەڕۆکە, حسێن بەگیش دەڵێت: مامۆستا تاتۆ دەگەڕێیتەوە, ئەگەر موچەکەم بۆنەناردن بزانە نەپیاوم نەژن.(ڕشتەی مرواری, ب2, دەزگای چاپو پەخشی سەردەم, سلێمانی, 2004, 314)

[1] ـ گەنجینەی مەردانو یاداشتی, ل68ـ69.

[2] ـ فەیروز حەسەن: سەرچاوەی پێشوو، ل3.

[3] ـ مەحمود عەزیز: سەرچاوەی پێشوو، ل14ـ15.

[4] ـ ئەمین زەکی بەگ: تاریخی سلێمانی, ب3, چ2, ل134.

[5] ـ هەمان سەرچاوە, ل133.

[6] ـ میربەسری: سەرچاوەی پێشوو، ل140.

[7] ـ محمد امين زكي: مشاهر الكرد في العهد الاسلامي, ج2, مطبعة السعادة مصر, 1947, ل58.

[8] ـ عەبدولکەریم حەمید: سەرچاوەی پێشوو، ل22.

[9] ـ میجرسۆن: مصدر السابق, ص280.

[10] ـ مەحمود عزیز: سەرچاوەی پێشوو، ل14.

ڕاستییەو لە ڕاستیش دوور ناکەوینەوە ئەگەر بڵێین عادیلە خانمی خێزانیو بە ڕەچەڵەك سنەیی، هاندەرو ڕاوێژکارو پشتیوانی بەتوانای بوو لە دروستکردنی یەکەم بازاڕی سەرگیراودا (قەیسەری)و حەمامی گشتیو کۆشکی خانەوادەکەی، هەموو ئەمانە لەسەر شێوەو شێوازی بیناسازی (سنە) دروستکراون کە لە هەموویاندا (تەکنیکی) گومەزی (تاق) لە بری (سەقف) بەکارهێنراوە [1].

وەسمان پاشا هەڵەبجەو پێنجوێنی زۆر ئاوەدانکردەوە، بە جۆرەها بازاڕو حەمامو مزگەوتو کاروانسەرا ڕازاندنییەوە [2]. بە حوکمی ئەوەی کە قایمقامی قەزاکەش بوو، کاروباری ئیداریو سیاسیشی بەدەستەوە بوو [3].

وەسمان پاشا بڕیاریدا کۆشکێکی بە ئەندازە نەخشێنراوی ئاوێنە بەندو نەخشو نیگارکراو بە داری ڕازاوەو دڵگیر دروست بکات، لە ناوەندی زەوییەکی فراواندا لە شێوەی چوارگۆشەدا کۆشکێکی ڕازاوەی سێ نهۆمی بە شێوەیەکی هونەریو ڕەونەقدار بۆ دروستکرا لە هەڵەبجە [4]، لە نهۆمی دووەمیدا مێژووی کۆتایی پێهاتنی دروستکردنی ئەم کۆشکە لە بەشی سەرەوەی دەروازەی ناوەڕاستیدا بە خەتێکی عەرەبی نووسراوێکی لەسەر نەخشێنراوە، ئەمەش دەقەکەیەتی بە عەرەبی: "إنا فتحنا لك فتحاً مُبينا، قد ختم هذا البناء العالي في شهر محرم في السنة 1321 الهجرية". بەپێی ئەم نووسراوە کۆشکی وەسمان پاشا بە (8) ساڵ تەواو بووە، چونکە لە ساڵی (1313ك) بنیادنراوەو لە ساڵی (1321ك) کە بەرامبەرە بە ساڵی (1901ز) تەواو بووە [5].

(عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم)یش، بە ئاماژەکردن بە بابەتێکی (عەبدوڕەقیب یوسف) کە ساڵی 1980 لە یەکێك لە گۆڤارەکاندا بڵاوی کردووەتەوە لەسەر کۆشکی وەسمان پاشا، ئەڵێت: "وەسمان پاشا گەلێ شوێنەوارو پاشماوەی لەدوای خۆی بەجێهێشتووە، لەوانە کۆشکو تەلارە بەنابانگەکەی لە شاری هەڵەبجەدا کە بە ئەندزیارییەکی وەها دروستکراوە بێ هاوتایە نەك لە کوردستاندا تەنانەت ڕەنگبێ لە هەموو عێراقیشدا، بە نموونە نەبیستراوە کە بنیاتێك یا خانوویەك بەو شێوەیە لە بەغداد هەبێت (لە ڕاستیدا ئەو کۆشکە کە بە تەلاری وەسمان پاشا) ناسرابوو نموونەیەکی بەرزی هونەری بیناسازی ئەو سەردەمە بووە کە پڕبووە لە نەخشو نیگارو بە ئاوێنەبەندو میناکاری ڕازێنرابووەوە" [6].

مێجەرسۆن لە کاتی گەشتەکەیدا بە ناوی (میرزا غوڵام حسینی شیرازی)ەوە بۆ ناوچەی هەڵەبجەو سلێمانی لە ساڵانی (1909 ـ 1910ز) [7]، باسی قەیسەری وەسمان پاشای کوڕی حەمە پاشای جاف دەکات لە سلێمانی، کە ڕەنگە لە نێوان ساڵانی (1905 ـ 1910) دروستکرابێ [8]. ئەو قەیسەرییە لە پێش قەیسەری (نەقیب) دروستکراوە، قەیسەری وەسمان پاشا بە پارەی (وەسمان پاشای جافو بنەماڵەی کەریمی عەلەکە) دروستکراوە، شێخ مستەفا نەقیب (مامی شێخ مەحمود) بۆ بەرپەرەکانی ئەو قەیسەرییە ئەویش قەیسەرییەکی دروستکرد کە بە قەیسەری (نەقیب) ناسراوە [9].

[1] ـ فەیروز حەسەن: سەرچاوەی پێشوو، ل32.
[2] ـ محەمەد ئەمین زەکی بەگ: تاریخی سلێمانی, ب3, چ2, ل134 .
[3] ـ هەمان سەرچاوە, ل134.
[4] ـ بەختیار غەفور هەڵەبجەیی: سەرچاوەی پێشوو, ل12.
[5] ـ هەمان سەرچاوە، ل13
[6] ـ عبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل22ـ23.
[7] ـ جەمال بابان: سلێمانی شارە گەشاوەکەم, ب2, ل247
[8] ـ هەمان سەرچاوە, ل247.
[9] ـ م. ڕ. هاوار: شێخ مەحمودی قارەمانو حکومەتەکەی خوارووی کوردستان, ب1, لەندەن, 1990, ل108 .

له ساڵی (1900ز) له سەردەمی قایمقامێتی وەسمان پاشادا بێخودی شاعیر لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە کرا بە حاکمی (دادوەر) هەڵەبجە[1]. عوسمان پاشا له ساڵانی دواییدا حکومەتی عوسمانی له خۆی خستبووه گومانەوە. تاهیر بەگو مەجید بەگی کوڕانی زۆر لایەنگری ئێران بوون.

لەڕاستیدا فشاری حکومەتی عوسمانی لەسەر عوسمان پاشا زیاتر بە هۆی (عادیلەخانم)ی خێزانییەوە بوو. کە بە شێوەیەکی سروشتی ئێرانی زۆر خۆشدەویست، جگەلە خزمەتکاری ئێرانی کەسی تری ڕانەدەگرتو نەشی دەهێشت له کاتی ئامادەبوونی خۆیدا بەتورکی قسه بکرێت[2]. بۆیە شتێکی سروشتی بوو کە تورکەکان ڕقیان لێی بێت، چونکه هەر تورکەکان بوون کە خواستنی ژنی یەکەمیان بۆ کردبوو، تا بتوانن (وەسمان پاشا) زیاتر لەماوەکانی پێشووتر لەخۆیان نزیك بخەنەوە، بەڵام خواستنی ئافرەتێك لەلایەن پاشاوە کە له بنەماڵەو خێزانە ناودارەکانی سنە[3] کە سەر بە فارسەکان بوونو ئەندامێك بوون له ئەنجومەنی وەزیران له تاران، کارێکی یەکجار نابەجێو ئاڵۆز بوو لەلای ئەفەندییەکانی تورك. بۆیە زۆر بێزارییو نارەزایی خۆیان دەربڕی کاتێك زانیان کە (عادیلەخانم) دەبێتە پشتوپەناو دەسەڵاتێکی بەهێز بۆعوسمان پاشاونزیکبوونەوەی لەئێران، تورکەکان پەنجەی پەشیمانیان گەستو، کەوتنە بیرکردنەوەو بزوتنەوەی بەرهەڵستی کردن بۆلەناوبردن وپووچەڵکردنەوەی ئەم لایەنگریودەسەڵاتە تازەی (خانم) بۆعوسمان پاشا، بەڵام هەموو ئەو هەوڵ و کۆششەی کە لەو پێناوەدا سەرفیان کرد بێ سوودوبێ نرخ بوو، هیچ یەکێك لەپلانەکانیان سەری نەگرت[4].

جەمال بابان لەکتێبی (سلێمانی شارە گەشاوەکەم)دا کاتێك ئاماژە بە دوا کارگێڕەکانی دەوڵەتی عوسمانی دەکات له لیوای سلێمانی لەساڵی1907، بەم شێوەیە ناوی کارگێڕەکانی شاری هەڵەبجە وەك قەزایەکی سەر بە لیوای سلێمانی ئەو سەردەم دەهێنێت:

قەزای گوڵعەنبەر (مەبەستی هەڵەبجەیە)

قائمقامی قەزا: عوسمان پاشا میری میران (مەبەستی وەسمان پاشای جافە)

نائب: احمد صائب افندی (مەبەستی مەلا ئەحمەدی صائب باوکی جەلال وجەمیل صائب)

مدیری مال: محەمەد شریف ئەفەندی

کاتب تحریر: مەحمەد سەعید ئەفەندی

دایەرەی نفوس

مامور: خالص افندی

کاتب: عەبدورەحمان ئەفەندی

محکمه بدائه

باشکاتب سلێمان بەگ

مستظق معاون: ڕشید ئەفەندی

کاتبی دووەم: عەبدولکەریم ئەفەندی

مامورانی تری قەزا

---

1 ـ محەمەد مەلا کەریم: دیوانی بێخود, چاپخانەی (سلمان الاعظمی), بەغدا, 1970, ل هـ.

2 ـ محەمەد ئەمین زەکی بەگ: تاریخی, ب3, چ2, ل135.

3 ـ مێجەرسۆن لەوەدا بەهەڵەچووە کە وتویەتی لەبنەماڵەی بەنی ئەردەڵانە.

4 ـ میجر سون: مصدر السابق, ص288ـ287.

مدیری تەلغوراف: ئەمین ئەفەندی

کاتبی تاپۆ: سلێمان بەگ

ئەو ناحیانەی سەربەم قەزایەن

یەکەم: ناحیەی قزڵجە (مەبەستی پێنجوێنە)

مدیر: صدیق افندی

کاتب: محمد علی افندی

دووەم: ناحیەی سرۆچك (مەبەستی بەرزنجەیە)

مدیر: منحل

کاتب: سعید افندی[1]

لەساڵنامەی عوسمانی ساڵی 1327ك/1909ز بەم شێوەیە باس لەدابەشکردنی کارگێڕی ـ ئیداری شاری سلێمانی وەك لیوایەکی سەر بە ویلایەتی موسڵ کراوە:

لیوای سلێمانی

| قەزا | ناحیە | گوند |
|---|---|---|
| سلێمانی | قەرەطاغ | 139 |
| گلعنبر | اليجە(البجە)، سرۆچك، قزلجە | 472 |
| معمورەحمید | قلعەدیزە، سورکاش، مرگە | 137 |
| بازیان | قلعەسیوك، سنگاو | 159و7عەشیرت[2] |

(عەبدوڵلا بەگ)ی کاتب فارسیش باپیری عەبدوڵلا گۆرانی شاعیری بەناوبانگ، شاعیرو نووسەری دیوانی وەسمان پاشای جاف بووە، لەبەر ئەوەی ئەو کات نووسین هەر بە زمانی فارسی بوو، بۆیە نازناوی (کاتب فارسی) لەلایەن ئەهلی دیوانەوە بۆ هەڵبژێردراوە، دوای عەبدوڵلا بەگ، سلێمان بەگی کوڕی ئەو ئەرکەی باوکی گرتە ئەستۆ، لە دیوانی پاشای

[1] ـ جەمال بابان: سلێمانی شارە گەشاوەکەم, ب2, ل39ـ40.

[2] ـ عەبدولخالید سابیر: ویلایەتی موسڵ لەساڵنامەی عوسمانیدا , گۆڤاری (هەزارمێرد) ژ(26), 2005,

جافداو ئەویش هەروەك باوكی هەر شاعیرو نووسەر بووە بە جۆرێك هەردوو شاعیری گەورەی بنەماڵەی بەگزادەی جاف (تاهیر بەگو ئەحمەد موختار بەگ) كوڕانی وەسمان پاشای جافو (خانم)ی ساحێبقڕان، زیاتر لەسەردەستی سلێمان بەگدا پێگەیشتوون[1].

ساڵی 1909 وەسمان پاشا[2]ی جاف مرد[3]، تاهیر بەگی كوڕی جێگای گرتەوەو بۆماوەیەك بوو بە قایمقامی هەڵەبجە. لەگەڵ هاتنی كۆمەڵی (ئیتیحادو تەرەقی) بۆسەر كورسی دەسەڵات لە توركیاو دورخستنەوەی سوڵتان عەبدولحەمید، قایمقامێتی ئەم قەزایەش لەدەست بەگزادەی جاف دەرچوو. لەوەبەدوا توركەكان هەر خۆیان قایمقامیان بۆ ئەم شارە دادەنا، تا ئەوكاتەی كە ئینگلیزەكان هاتنە عێراقەوە[4]. (عادیلە خانم)یش لەدوای مردنی عوسمان پاشای مێردی بوو بە سەرۆكی عێلی جافو دەسەڵاتی خۆی بە تەواوی لە ناوچەكەدا چەسپاند[5].

## چوارەم: هەڵەبجە لەسەردەمی عادیلە خانمدا

عادیلەخان كچی عەبدولقادر بەگی كوڕی ڕۆستەم بەگی كوڕی ئەحمەد بەگی ساحێبقڕانە[6] لە ساڵی 1859 لە شاری (سنە) لەدایك بووە[7]. حەسەن فەهمی جاف دەڵێت: "خانم لە بەگزادەكانی ساحێبقڕانەو خەڵكی سلێمانییە. لەپاش نەمانی ئەمارەتی بابان، قادر بەگی باوكی چاوی بەرایی نەهات لە سلێمانی بمێنێتەوە، لەبەرئەوە ڕۆشتووە بۆ (سنە)، خانم لەوێ لەدایك بووە"[8].

جەمال بابان، لە باسكردنی بنەماڵە ناودارەكانی سلێمانیدا، كە یەكێك لەو بنەماڵانەش، بنەماڵەی ساحێبقڕان بووە، ئەو ڕەچەڵەكی خانم دەباتەوە سەر ئەم بنەماڵەیە[9].

(د. عیزەدین مستەفا)یش، سەبارەت بە ڕەچەڵەكی (خانم) دەڵێت: "هەرچی بنەچەی خانمە، ئەوە ئاشكرایە كە لە سنەوە هاتووە، هەندێك بە نەوەی بەنی ئەردەلانی ئەزانن‌و هەندێك بە نەوەی (ساحێبقڕان)ی ئەزانن، بەڵام نەوەكانی خانم دەڵێن: خانم كچی قادر بەگی ساحێبقڕانەو دایكی لە بنەماڵەی وەزیرییەی بەناوبانگی سنەیە"[10]. بەهەمان شێوە (ئیدمۆندز)یش، ڕەچەڵەكی خانم دەباتەوە سەربنەماڵەی ساحێبقڕان لە سلێمانی[11].

---

[1] ـ جەمال بابان‌و ئەوانی تر: سلێمانی شارە گەشاوەكەم, ب3, ل72.

[2] ـ عوسمان پاشا جگە لە كچ پێنج كوڕی هەبووە ئەوانیش: مەجید بەگ, تاهیر بەگ, حەمەسەعید بەگ, عیزەت بەگ, ئەحمەد موختار.

[3] ـ بەكر حەمەصدیق عارف: هەڵەبجە قوربانی , گۆڤاری (هەڵەبجە), ل69.

[4] ـ حەسەن فەهمی بەگی جاف: سەرچاوەی پێشوو, ل61,62.

[5] ـ بەكر حەمە صدیق عارف: هەڵەبجە قوربانی , گۆڤاری (هەڵە بجە), ل 69.

[6] ـ تایەر بەگی عوسمان پاشای جاف: دیوانی تاهیر بەگ, چ3, چاپخانەی هەولێر, هەولێر, 1966, لbd.

[7] ـ شێخ علی: سەرچاوەی پێشوو، ل12.

[8] ـ حەسەن فەهمی: سەرچاوەی پێشوو، ب2, ل70.

[9] ـ جەمال بابان‌و ئەوانی تر: سلێمانی شارە گەشاوەكەم, ب3, ل67.

[10] ـ دیوانی ئەحمەد موختار جاف, بەغدا, 1986, ب3, ل67.

[11] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو، ل88.

خانم یەکێك بووە لە ژنە هەڵکەوتوو ناودارەکانی کورد[1]. لە ساڵی (1895ز) شووی بە عوسمان پاشای[2] کوڕی حەمە پاشای جاف کردووە[3]. خانمی زیرەكو لێهاتوو، بەشداری لە بەڕێوەبردنی کاروباری بنەماڵەو عەشیرەتی جافدا کردووە، چونکە وەسمان پاشا گەشتی دەرەوەی هەڵەبجەو دوورکەوتنەوەی لە ماڵو عەشرەت زۆر بووە، لەبەرئەوە خانم جێگرو یاریدەدەری بوو[4]. عادیلە خان لەو ڕووەوە بەبیرو تەدبیری ڕووناك یارمەتی عوسمان پاشای هاوسەری دەداو لە هەموو ئیشو کارێکدا ئامۆژگاریو ڕابەری دەکرد، بێجگە لە هەڵسوڕاندنی ناوماڵو عەشیرەت، بەو جۆرە بە لێهاتوویی خۆی دەورێکی باڵای دەنواند لە بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی فراوانو لەناو هۆزو عەشیرەتەکاندا ناوبانگو شۆرەتی دەنگیدایەوەو پلەوپایەیەکی گەورەی بەدەستهێنا[5].

لە ڕاستیدا عادیلەخان حوکمی مێردەکەی دەکردو هەموو ئەندامانی عێلی جاف بەلای خۆیدا ڕاکێشابوو، لەگەڵیاندا بە ژیریو نەرمو نیانیو هەندێ جار بە توندو تیژی دەجولایەوە، دیوەخانەکەیان پڕبووە لە پیاوی گەورەو شاعیرو ئەدیبو سەرۆکی تیرەکانی هۆزی جاف[6]. هەر (خانم) بووە وەسمان پاشای بەرەو شارستانیەت بردووە لە هەڵەبجەدا، دروستکردنی قەیسەریو حەمامی پاشاو تەنانەت خودی ماڵی پاشاش هەر لەژێر کاریگەری ئەودا بووە کە وەسمان پاشا هەستاوە بە دروستکردنیان[7]. بەر لە مردنی وەسمان پاشا هەموو دەسەڵاتەکانی کەوتبووە دەست عادیلەخانم[8].

راستیشت دەوێ عادیلەخان چ لەسەردەمی عوسمان پاشا چ لەدوای مردنی ئەو، هەرخۆی خاوەن بڕیاربووە لەزۆربەی لایەنە جۆربەجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئیداریدا[9]. خانم هەمیشە هەوڵیداوە برایەتیو دۆستایەتی نێوان مەحمود پاشاو وەسمان پاشا زیاتر پتەوبێت[10].

**کارەکانی خانم دوای هاتنی بۆ هەڵەبجە**

---

[1] ـ د.عیزەدین مستەفا ڕەسولْ:دیوانی ئەحمەد موختار جاف, ل8.

[2] ـ گێڕانەوە مێژووییەکان زۆر ڕووداوی سەیروسەمەرەی ژن هێنانو شووکردنی خەڵکانی نێوکۆمەڵگەی کوردەواریمان لەرابردوودا بۆ دەگێڕنەوە, ڕەنگە زۆر لەراستی دورنەکەوینەوە ئەگەر بڵێین شوکردنی خانم بەکەسێکی وەکو وەسمان پاشا یەکێکە لەو روداوانە. وەسمان پاشا لەسەردانێکیدا بۆ شاری سنە ڕێی دەکەوێتە ماڵی قادر بەگی ساحێبقڕان، واتە ماڵی خانم, وەسمان پاشا لەو سەردانەیدا چاوی بەخانمی شۆخو شەنگو جوان دەکەوێت, زۆر بەدڵیدا دەچێ، بۆیە دوای گەڕانەوەی بۆ هەڵەبجە راستەوخۆ بڕیاری داواکردنی دەدات, بۆ ئەم مەبەستە شێخ حەمەومینی عەبابەیلێ کەپیاوێکی قۆزی چوارشانە دەبێت دەنێرێت بۆ سنە بۆ داواکردنی خانم. دابوونەریتی کۆمەڵگای کوردەواری ئەو سەردەمیش بەشێوەیەك بووە کە ئافرەت عەیب بووە پیاوببینێ, هەرچی لە عادیلەخانمە شێخ بۆخۆیی داوا دەکات, وەسمان پاشا دەستێکی تۆزی گۆج بووە هەروەها دەمو چاویشی روشبووە, دوای گواستنەوەی کە خانم چاوی بەوەسمان پاشا دەکەوێت بەو شێوەیە خانم دەڵێت من شووم بەم پیاوە نەکردوە، بەڵکو شووم بەو کەسە کردووە کە هاتووە بۆ داوام, خانم و وەسمان پاشا تێکدەگیرێن لەسەر ئەومەسەلەیە. لەسەر ئەمە پاشا داوای لە شێخ حەمەئەمین کرد کە بۆماوەیەك هەڵەبجە بەجێبهێڵێت . پاش چەند مانگێك کە شێخ گەڕاوەتەوە بۆ هەڵەبجە, ڕۆژێك خانم لە نهۆمی دووەمی کۆشکەکەی خۆیانەوە چاوی بە شێخ دەکەوێت کە بەسواری ئەسپێکەوە بەبەردەم ماڵی ئەواندا رەتدەبێ ،خانم دەڵێ ئا ئەو پیاوە هاتووە بۆ داوای منو من وامزانیوە شوو بەو پیاوە دەکەم.

[3] ـ بەختیار غەفور هەلەبجەیی: شوێنەواری کۆشکی وەسمان پاشای جاف لە هەڵەبجە, ڕ(کوردستانی نوێ), ژ(2281), 2000/10/19.

[4] ـ د. مارف خەزنەدار: مێژووی ئەدەبی کوردی, ب 4, چاپو بڵاوکراوەی ئاراس, هەولێر, 2004, ل565.

[5] ـ عەبدولجەبار محەمەد: ئافرەتە ناودارەکانی کورد, چاپخانەی الجمهوریة, کەرکوك, 1969, ل19.

[6] ـ نمونەی ئافرەتانی ناوچەی سلێمانی لەمێژوودا, گۆڤاری (بابان) , ژ(1), 2006, ل69.

[7] ـ تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان, د. عیزەدین مستەفا ڕەسولْ, 2006/3/16

[8] ـ هێنی هارۆڵد ولْسن, ژیانی ئافرەتی کورد, و. عەزیز گەردی, چاپخانەی کۆڕی زانیاری، بەغدا,1983، ل27.

[9] ـ فەیروز حەسەن: سەرچاوەی پێشوو، ل3.

[10] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل25.

1ـ هەولّدان بۆ بەهێز کردنی مەرکەزی خۆی، ئەوەی یارمەتی ئەدا بۆ ئەم مەبەستە لایەنی ڕێزو گەورەیی دەسەلاتی خێزانەکەی بوو. وەسمان پاشاش لەم ڕووەوە هیچ ڕێگری لێنەدەکرد.

2ـ دوو خانووی زۆر گەورەی لەسەر شێوازی (سنە)و وێنەی لە سلێمانیدا نەبووی دروستکرد، وەستاو بەنای تایبەتی لە ئێرانەوە بۆ هێنابوون [1].

3ـ زۆربەی خزمەتکارەکانی فارس بوون [2]، هەمیشە دەرگای ماڵەکەی لەسەرپشت بوو بۆ میوانو هاتوچۆکەرانی کوردەکانی ئێران، پەیوەندییەکی بەهێزو هەمیشەیی لەگەڵ (سنە)دا کە پێنج ڕۆژە ڕێ لە هەڵەبجەوە دووربوو دامەزراند [3].

4ـ هەوالگریو مامەڵەکرنی هەر بە زمانی فارسی بوو [4].

5ـ بەندینخانەیەکی نوێی دروستکرد، لەگەڵ دامەزراندنی دادگایەکی سەربەخۆ، کە خۆی سەرۆکایەتی دەکرد، بەم شێوەیە دەسەلاتی چەسپاند [5].

6ـ جڵەوی دەسەلاتی فەرماندەیی ڕامیاری وردە وردە وەردەگرت، لەو کاتانەدا کە وەسمان پاشا زۆرجارو ناویەناو بانگ دەکرا بۆ موسڵو کەرکووکو سلێمانی بۆ هەندێك تێبینی کاروباری گرنگایەتی میری، لەم کاتانەدا (خانم) دەبوو بە نوێنەرو فەرمانڕەوایی دەکرد [6]. هێزو دەسەلاتی (خانم) بەسەر عوسمان پاشاو ناوچەی شارەزوورو جافدا زاڵ بووبوو [7].

7ـ ئەمین زەکی بەگ دەڵێت: "موحافەزەی عوسمان پاشاو مەحمود پاشا، بە سایەی سیاسەتی خانمەوە بوو، چونکە نەیدەویست بە عاجزیو بە شەڕی دوو برا حوکمو نفوزی عەشیرەتەکە زەعیف بکا. نفوزی تەنیا لە شارەزووردا نەبوو، لە وڵاتی ئەردەڵانیشدا قسەو ئەمری خانم جاری بوو، بە دەرەجەیەکی وا بەعزێ عەشائیری ئێرانیش خانمیان بە ڕەئیسو حامی خۆیان دائەنا" [8].

8ـ دەستێکی باشی خستە کاروباری شارەوانییەوە. لە سەردەمی ئەودا هەڵەبجە بووە شارێکی جوانو ئاوەدان [9].

9ـ جگە لەوەی ئاڵوگۆڕی نامەو کاروباری هەر بە زمانی فارسی بوو [10]، ڕێگای بە کەس نەدەدا لە دیوەخانەکەیدا بە فارسی قسەبکەن [11].

10ـ هیچ فەرمانو کاروبارێکی میری جێبەجێ نەدەکرا بەبێ ڕاوێژکردن بە ئەو، هەموو گیروگرفتێکی ناوخۆ دەهێنرایە بەردەستیو بە دادپەروەرانە یەکلایی دەکردەوە [12]. چونکە زۆر سیاسیو ژیرو بەدەست بووە [13].

---

1 ـ میجرسون: مصدر السابق, ص280.

2 Susan meiselas:Kurdistan the shadow of history 1997 p 74

3 ـ میجرسون: مصدرالسابق, ص280.

4 ـ ئەمین زەکی بەگ: تاریخی سلێمانی, ب3, چ2, ل135.

5 Susan meiselas: Kurdistan the shadow of history p74

6 ـ میجرسون: مصدر السابق, ص280 . مەحمود عەزیز: سەرچاوەی پێشوو, ل41.

7 ـ ئەمین زەکی بەگ: تاریخی سلێمانی, ب3, چ3, ل135.

8 ـ هەمان سەرچاوە, ل135.

9 ـ میجرسون: مصدر السابق, ص281.

10 ـ میربەسری: سەرچاوەی پێشوو, ل141.

11 ـ هەمان سەرچاوە, ل141.

12 ـ عەبدولجەبار محەمەد: سەرچاوەی پێشوو, ل20.

13 ـ حەسەن فەهمی جاف: سەرچاوەی پێشوو, ل68.

هەموو ئەم کارانەی خانم، هێندەی تر تورکەکانی بێزارو نیگەران تر کرد، عوسمانییەکان بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆیان بسەپێنن بەسەر وەسمان پاشادا، دەستیانکرد بە ڕاکێشانی هێڵی تەلەفونو بروسکە. بەڵام هۆزەکان بە شێوەیەکی گشتیو عادیلەخانم بەتایبەتی، دەستیانکرد بە بەرپەرچدانەوەی ئەو کارەی تورکەکان، بە بڕینی تەلی هێڵەکان، ئامۆژگارییان کردن کە واز لەم کارەیان بهێنن، هەڕەشەی لێکردن بە تێکدانی هێڵو خەتەکانیان، چونکە جافەکان نەیانویست بە هۆی ئەم کارەیانەوە دەستی تورکەکانیان لێ نزیك ببێتەوە [1].

(مێجەرسۆن)یش باسی لەوە کردووە کە جافەکان بە هیچ شێوەیەك نەیاندەویست ملکەچی تورکەکان بن، مەگەر بە کەمی نەبوایە، یاخود هەر ملکەچ نەدەبوون، یاخود ئەگەر ڕازیش بونایە ئەوا بە شێوەیەکی زۆر کەم ڕازی دەبوون بە دەسەڵاتی عوسمانی لە هەڵەبجەدا. سەرەڕای بوونی هەندێك کارگوزاری تورك لەو شارەدا [2].

لە وەرزی هاوینو گەرمبوونی ئاوو هەوای هەڵەبجەدا، خانم دەڕۆیشت بۆ هاوینەهەوارەکانی گوندەکانی هەورامانی نزیك هەڵەبجەو هەورامانی ئەودیویش، نزیکەی (3 تا4) مانگ لەو هاوینەهەوارە فێنكو کوێستانانەدا دەمایەوە، بەم شێوەیە لەم گۆشە دوورەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لاوازدا، لەم پارچە زەوییە نا دوورو کەم وێنەدا فەرمانڕەواییەك هەڵکەوت بوونی خۆی چەسپاند لە ژێر سایەو دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی ئافرەتێکی کورددا [3].

لە سەردەمی دەسەڵاتداریێتی تورکەکاندا، چەند ساڵێك بەر لە شەڕی یەکەمی جیهانی، (مێجەرسۆن)ی ناسراو سەفەری بۆ کوردستانی عێراق کردووە، دوای چەند ساڵێك مانەوە لەو مەڵبەندە ڕۆیشتووەتەماڵی وەسمان پاشا [4]، بە خزمەتگوزار وەرگیراوەو چەند مانگێك لە ماڵیاندا مایەوە، سۆن خۆی بە (میرزا غوڵام حسەین) ناساندبوو. (غوڵام حسەین) وەك خزمەتکارێکی چالاك بەخێرایی ئیشوکارەکانی سەرشانی خۆی ڕادەپەڕاند. لەبەرئەوە تاهیر بەگ [5] زۆری لا بەڕێز بوو خۆشی دەویست، بەڵام بەهۆی هەندێك کارو کردەوەی، تاهیر بەگ گومانی لێی هەبوو، ئەو سەرنجی ئەوەی دابوو کە شێوازی کارو گوێڕایەڵی (سۆن) لە ڕەفتاری خزمەتارێك ناچێ [6].

ڕۆژێك تاهیر بەگ سەیری کتێبێکی فەڕەنسی دەکات، غوڵام حسەین (مێجەرسۆن) پێی دەڵێت:"ئاغا لەوە دەچێ ئێوە زمانی فەڕەنسیش بزانن؟" تاهیر بەگ لەوەڵامیدا دەڵێت: "بەڵێ هەندێکی لێدەزانم، ئێوەچی ، هیچی لێ تێدەگەن؟"

غوڵام حسەین دەڵێت:"بەڵێ، شەش حەوت ساڵ پێش ئێستا خزمەتکاری کابرایەکی فەڕەنسی بووم لەئێرانوهەندێکی لێ فێربووم".

تاهیر بەگ کاتێك بەم مەسەلەی زانی هەمیشە دەربارەی کارە نهێنیەکان بەزمانی فەڕەنسی قسەی لەگەڵ غوڵام حسەین(مێجەرسۆن)دا دەکرد. ڕۆژێك لە وەڵامی پرسیارێکی (تاهیر بەگ)دا کەلێی کردبوو لەبری ئەوەی بڵێ (نەء)، سۆن

---

[1] ـ احمد خواجه افندی: قیام شیخ محمود برزنجی ومردم کرد, ت.احمدی محمدی, سنندج, چاپخانه روستم خانی, 1380 شەمسی, ل107.

[2] ـ میجرسون: مصدر السابق, ص272.

[3] ـ مصدر نفسه, ص281ـ282 . مەحمود عزیز: سەرچاوەی پێشوو, ل42.

[4] ـ جگە لەوەی کە مێجەرسۆن ماوەی (9) مانگ لەماڵی خانمدا ماوەتەوەو هاوڕێی نزیکی تاهیر بەگ بووە, لەکتێبەکەیدا چەند جارێك جەخت لەسەرئەوە دەکاتەوە کە تاهیر بەگ لە ژنی یەکەمی وەسمان پاشایە, بەهەمان شێوە زۆربەی سەرچاوەکان دەڵێن لە ساڵی (1878) لەدایك بووە, لەکاتێکدا زۆربەی سەرچاوەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کەخانم لەساڵی 1895دا شووی کردووە بە وەسمان پاشای جاف, لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین تاهیر بەگ لەژنی یەکەمە نەك لەعادیلەخانم.

5 ـ تاهیر بەگ کوڕی وەسمان پاشای کوڕی حەمە پاشایە, لەساڵی (1295ك/1878ز) لە هەڵەبجە لەدایك بووەو لەساڵی (1337ك/1918ز) بەنەخۆشی سیل کۆچی دوایی کردووە. (ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو, ل565)

[6] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو, ل192ـ193.

دەڵێ (no = نۆ)، لێرەدا تاهیر بەگ ئەوەی بۆ ئاشکرابوو کە (سۆن) کەسێکی ئێرانی نییە بەڵکو ئینگلیزە، چونکە وشەی (no) وشەیەکی ئینگلیزییە کە بە مانای (نا) دێت.

لەبەرئەوە تاهیر بەگ بانگی کردوو لێی پرسی ناوت چییە؟

غولاًم حسەین وتی:لەسەرت گەڕێم لە مەبەستی ئێوە تێناگەم؟ ناوی من هەر ئەو ناوەیە کە ئێوە منی پێ بانگ دەکەن.

تاهیر بەگ وتی: نا تۆناوی خۆتت گۆڕیوە ، تۆ ئینگلیزی.

غولاًم حسەین وتی: چۆن دەزانی؟

تاهیر بەگ وتی: لە شێوازی گفتوگۆو قسەکردنتدا دەردەکەوێ.

غولاًم حسەین وتی: ڕاست دەفەرمون، من ئینگلیزمو ناوم (مێجەرسۆن)ە ، چەند ساڵە لەوڵاتی عێراقو ئێرانو عوسمانیدا دەگەڕێم.

تاهیر بەگ هەر کە بۆی ساغبویەوە داوای لە مێجەرسۆن کرد کە لەو ناوەدا نەمێنێت، چونکە پێی وابوو پەیوەندی ئەوان (بەگزادەکان) لەگەڵ حکومەتدا لەو ڕۆژانەدا ڕوو لەساردبوونەوە دەکات، ئەوکات لەوانەیە لەلایەن تورکەکانەوە تووشی ئازارو چەرمەسەری ببێت.[1]

(ئیدمۆندز)یش، ئاماژە بەوە دەکات کە خۆی ڕۆژێك پرسیاری لە (عادیلە خانم) کردووە سەبارەت بەوەی کاتێك سۆن لە ماڵیان بووە هەرگیز شکی لە سۆن نەکردووە؟ عادیلەخانیش لە وەڵامدا وتوویەتی: "ڕاستییەکەی، لەبیرمە ڕۆژێك تاهیری کوڕم هاتە لامو گوتی لاموایە ئەو غولاًم حسەینە ئەوروپایی بێ، بەڵام من گوتم هەرچۆنێك بێت ئەو میوانی ئێمەیەو نابێ ئێمە خۆمان لە کارێك وەردەین پەیوەندی بە ئێمەوە نییە".[2]

مینۆرسکی، دەڵێت: "لە پایزی ساڵی 1914دا لەهەڵەبجەی نزیکی سلێمانی، ژنێکی بەناوبانگمان چاوپێکەوت بەناوی (عادیلە خانم) بێوەژنی عوسمان پاشای جاف کە هەتا چەند ساڵ لەوەوپێش ئەو ناوچەیەی بە تەواوی ئیدارە دەکرد کە لەلایەن تورکەکانەوە بە ناو بە مێردەکەی سپێردرابوو، ئەویش قەت لەوێ نەبوو. سۆن کە جلوبەرگی بازرگانێکی ئێرانی لەبەرکردبوو ماوەیەك لە دیوەخانی ئەو ژنە مایەوە، بەشێوەیەکی زۆر سەرنجڕاکێش شەرحی ئەوەی داوە کە چۆن ئەو ژنە بە کێشەی ناو ڕەعیەتەکانی ڕادەگەیشت، کاروباری ئەوانی جێبەجێ دەکرد بەبێ ئەوەی کە کاری ژنانەی خۆشی لەبیر بەرێتەوە وەك پارچە کڕینو کاری ناوماڵ.[3] بەڵام لە ئێستادا حکومەتی تورکی فەرمانبەرێکی بەرەگەز تورکی ناردووە بۆ هەڵەبجەو ئەوەش بووەتە هۆی دوورخستنەوەی (عادیلە خانم) لە فەرمانڕەوایەتی بۆ ئەوەی تا ڕادەیەك بە ئاسوودەیی بژی، ئەم ئافرەتە بە شێوەیەکی چاك پارێزگاری لە خۆی کردووە، جارێکیان هات بۆ لامان بۆ بارەگاکەمان، کۆمەڵێك بووکو کارەکەری لەگەڵدا بوو، بە دڵخۆشییەوە ڕازی بوو وێنەی بگرین. بە نامەیەکیش کە بە زمانی فەڕەنسی نووسرابوو لە وەڵامدا بۆ ئەو دیارییانەی کە پێشکەشم کردبوو بە کوڕەکەی، سوپاسی کردبووم. لە دواییدا دەرکەوت کە ئەو نامەیە گەنجێکی کورد نووسیبووی کە لە شاری سنەدا لەلایەن میسیۆنێرە کاسۆلیکەکانی فەرەنسی خوێندبووی. خاوەنی هەڵەبجە بایەخێکی زۆری بەو تەنها ئافرەتە ئەوروپاییە دەدا کە لە نێردە زانستییەکەی ئێمەدا بوو".[4]

---

[1] ـ هەمان سەرچاوە,ل193. حەسەن گۆران: دیوان تاهیر بەگ (1878ـ1918), سنندج, 2702کوردی, ل9.

[2] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو, ل192ـ194ـ195.

[3] ـ واسیلی نیکتین: کوردو کوردستان, و.خالد حسامی (هێدی), چاپخانەی (زانکۆی سەلاحەدین), هەولێر, 1998, ل36.

[4] ـ مینوریسکی: کورد, و. حەمە سەعید حەمە کەریم, چاپخانەی (زانکۆی سەلاحەدین), 1984, ل161ـ162.

خانمی وەسمان پاشا وەك شاژنێك لەناو عەشیرەتی جافدا پلەو پایەیەکی گەورەی هەبوو، لە سەروبەندی ژیانی وەسمان پاشاشدا هەیبەتو دەسەڵاتێکی سەیری هەبوو، لەلایەکی ترەوە ئافرەتێکی دڵو داوێنپاك بووە، لە بەرامبەر هەژاراندا زۆر چاك بووە، خەڵکانی بەتەمەنی شاری هەڵەبجە باس لەوە دەکەن کەلەماوەی ساڵانی گرانیدا، کە یەك مەن گەنم بە (6) لیرەی سوور بووە، کە هاوکات بووە لەگەڵ ساڵانی جەنگی جیهانی یەکەمدا، لەو کاتانەدا خانم بڕیاریداوە هەموو هەفتەیەك (7) حەوت سەر مەڕ سەرببڕنو گۆشتەکەی بەسەر فەقیرو هەژارانی شاردا بیەخشنەوە، تا ئەوکاتەی گرانییەکە تەواو دەبێت، لەلایەکی ترەوە خانم دەستێکی باڵای هەبووە لە خزمەتکردنی مەلاو فەقێو خەڵکانی ئایینیو مزگەوتەکانی هەڵەبجەو دەوروبەری. عادیلەخان لە شاری هەڵەبجەدا مزگەوتێکی بە ناوی خۆیەوە دروستکرد، ئەوەی جێگای باسە تا ئێستاش ئەو مزگەوتە لەو شارەدا ماوە[1].

ساڵی 1918 پاش پاشەکشەکردنو تێکشکانی هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانیو داگیرکردنی ویلایەتەکانی (بەغدا، بەسرە، موسڵ)و دواتر یەکخستنیان لەلایەن هێزەکانی ئینگلیزەوە، هەڵەبجە لە سایەی قەڵەمڕەوی خانمی وەسمان پاشادا بووەو ناوبراو بەسەر ناوچەکەدا ڕادەگەیشت[2]. پاش ئینتیدابی بەریتانی لێپرسراو سیاسییەکانی بریتانیا ڕووی قسەو گفتوگۆیان هەر لەگەڵ ئەودا بوو[3].

عادیلە خانم لە مانگی تەموزی ساڵی 1924داو لە تەمەنی (65) ساڵیدا کۆچی دوایی کردوو، دواتر تەرمەکەی لە گۆڕستانی (عەبابەیلێ)ی نزیك هەڵەبجە بەخاك سپێردرا[4].

[1] ـ بەوەرگرتن لە بەکر حەمە صدیق عارف: لاپەڕەیەك لە, ل63.

[2] ـ کەشکۆڵ, هەڵەبجە لە هەڵدێری مێژوودا, گۆڤاری(خەرمان), ژ (8), 1993, ل4.

[3] ـ هێنی هارۆڵد ۆڵسن: ژیانی ئافرەتی کورد, ل27.

[4] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل27, ساڵنامەی سلێمانی, 1999, ل412.

# بەشی سێیەم:

# هەڵەبجە لە ماوەی حوکمڕانی بەریتانیادا

## باسی یەکەم: پەیوەندی نێوان هەڵەبجە و شۆڕشی شێخ مەحمود

### یەکەم: پێشینەی پەیوەندییەکانی نێوان جاف و بنەماڵەی شێخان

شاری هەڵەبجە، لەبەرئەوەی مەڵبەندی جافەکان بوو، هەروەك پێشتر باسمان کرد، جۆرێك لە سەربەخۆیی خۆیان هەبووە لە چوارچێوەی دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا لەم ناوچەیەدا، وەك لە ژیانی مەحمود پاشای جافدا باسکراوە، ئەگەر لەبەر هەندێ هۆکاری تایبەتی نەبوایە ئەوا داروپەردووی تورکەکانی لە کوردستاندا بەسەر یەکەوە نەدەهێشت، چونکە ناوبراو حەزی نەدەکرد کە تورکەکان پێ بەسەر خاك و ئاوی شارەزووردا بنێن، ئەم بۆچوونەش دەگەڕایەوە بۆ پێش ساڵی 1900ز.[1]

(عەلی ئەکبەر سنجابی)یش، باسی لەوە کردووە کە مەحمود پاشا لەلای ئەو گلەیی ئەوەی لە تایەر بەگی برازای کردووە، سەبارەت بە ئیشوکارەکانی تایەر بەگو ئەوەشی گوتووە کە ئەگەر تایەر بەگ ڕێگەی بدایەو نەبوایەتە ڕێگر لەبەردەمیدا نەیدەهێشت تاکە کەسێکی عوسمانی لەو ناچەیەدا بمایەتەوە.[2]

لێرەدا دەبێ ئەو ڕاستیە بزانین کەعەشیرەتی جاف لەو سەردەمەدا یەکێك بووە لە عەشیرەتە گەورەو دەسەڵاتدارەکانی خوارووی کوردستان، هەر لەسەردەمی دەسەڵاتداریێتی عوسمانیەکانەوە لەناوچەکەدا قورساییەکی تایبەتی خۆی هەبووە لەو ناوچەکەدا، بۆیە کاتێکیش کە ئینگلیزەکان هاتنە کوردستانەوە بە هەمان چاو سەیری جافیان دەکرد، وەك لە نووسینەکانیاندا بە ئاشکرا ئەو ڕاستییە هەستی پێدەکرێت.[3]

بەڵام سەبارەت بە بنەماڵەی شێخان، هەر لەدوای ڕووخانی میرنشینی بابانو نەمانی ئەو دەسەڵاتە کوردیە، بۆشاییەکی گەورەی سیاسیو کارگێڕی لەشاری سلێمانیدا دروست بوو ، ئەوکاتەش بنەماڵەی شێخان خەریك بوو لەبنەماڵەیەکی ئاینیەوە دەبوون بەدەسەڵاتدارو خاوەن موڵكو زەویو زار، هەر بۆیە ئەو بۆشاییەیان پڕکردەوە کەنەمانی بابانیەکان درووستی کردبوو، کەبێگومان کارێکی هێندە ئاسان نەبوو.

دەسەڵات پەیداکردنو دەوڵەمەندبوونی ئەم بنەماڵەیە، بۆ ئەو پلەوپایە ئاینییە دەگەڕێتەوە کە لە شێخ مارفی نۆدێو بەتایبەتی کاك ئەحمەدی شێخەوە بۆیان مابۆوە، وێڕای ئەوەی کاتێك دەوڵەتی عوسمانی توانای بەڕێوەبردنی وڵاتی نەمابوو زەویەکانی بەکرێ دەدا کەپێی دەوترا (لزمە)، ئیدی شێخ سەعیدی کوڕەزای کاك ئەحمەدی شێخ بڕێکی زۆری لەو زەویو زارانە بەکرێ گرتو هەندێکی کڕیو هەندێکیشی زەوت کرد، ناوبراو لەبنەماڵی شێخاندا لەهەمووان زیاتر ناوی دەرکردو دەسەڵاتی پەیداکرد.

دەوڵەتی عوسمانیش، ئەو سەردەمانە نەریتێکی پەیڕەو دەکرد کە بریتی بوو لە گرنگی پێدانو نزیککردنەوەی ئەو بنەماڵەو خانەوادانەی خاوەن ناوو ناوبانگو پلەوپایەو بە دەسەڵات بوون، بەتایبەتی پیاوانی ئاینیو سەرۆك خێڵو

---

[1] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: لاپەڕەیەك لە, ل70.

[2] ـ ایل سنجابی ومجاهدت, ل544.

[3] ـ م. ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب1, ل202.

دەرەبەگەکان. هەر بۆیە سولْتان عەبدولحەمیدی دووەم پەیوەندیەکی باشی لەگەلْ کاك ئەحمەدی شێخدا هەبوو، دواتریش بەهەمان شێوە لەگەلْ شێخ سەعیدی کوڕەزاشیدا پەیوەندییەکی بەتینیان هەبوو [1].

تادەهات ناوو شۆرەتی شێخ سەعید زیادی دەکرد، ئەوەبوو سالّی (1901ـ1902ز) لەلایەن سولْتانەوە بەڕەسمی بانگهێشت کرا بۆ ئەستەمبولْ، ئەویش بەیاوەری هەر سێ کوڕەکەی (شێخ ئەحمەدو شێخ مەحمودو شێخ قادر)و دەستەیەك لەپیاوانی ناوداری سلێمانی ڕۆیشتن بۆ ئەستەمبولْ [2]. دوای گەڕانەوەیان لەو سەفەرە ئیدی ئەم ناوبانگو دەسەلاتەی شێخ سەعید بووە هۆی ئەوەی کە هەندێك لە ئەندامانی بنەماڵەکەو دەستو پێوەندەکانیان ئەم بارە بقۆزنەوەو بکەونە خۆدەرخستنو ئازاردانی خەلْکی، بەتایبەتی دوای گەڕانەوەی شێخ سەعید لەسەفەرەکەی ئەستەمبولْ، دەستو پێوەندەکانیان کەوتبوونە هەوای خۆیانەوەو لە هەموو کاروبارێکدا دەستدرێژیان دەکردو سەرئێشەی زۆریان بۆ شێخان دەنایەوە. ئەمەش لە ئاکامدا بووە هۆی ئەوەی ئەم خانەوادەیە زیاترو زیاتر ناحەزو دوژمنیان بۆپەیدا ببێت، جا چ لەنێو بنەماڵە بەناوبانگەکانی ئەو ڕۆژگارەی سلێمانی، چ لەناو بازرگانو پارەدارو ئەو تازە ئەفسەرانەی کە لە ئەستەمبولْ گەڕابوونەوە [3].

لەگەلْ ئەوەشدا لە کاتی خۆیدا جافەکان ڕێزیان لە شێخ مارف نۆدێ‌و کاك ئەحمەدی کوڕی گرتووە، بەهۆی پایەی ئایینی‌و پلەی خوێندەواری‌و زانیارییانەوە، بەلاّم کاتێك کە شێخ سەعیدو شێخ مارف نەقیبو لە دوای ئەوانیش شێخ مەحمود بوون بە خاوەن زەوی‌و زارو عوسمانییەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان کەوتنە ئەوەی بایەخی تایبەتی بدەن بە شێخان، لێرەوە وردە وردە جافەکان وەکو هەندێ عەشائیری تری ناوچەکە کەوتنە بەربەرەکانی کردنی شێخانو حەزیان بە بوونی دەسەلاتیان نەدەکردو پێیان خۆش نەبوو لەناو خەلْکیدا ناوبانگیان بلاوبێتەوە [4].

هەلْبەتە ئەو دەولْەتو زلهێزانەش هەریەکە بۆ هەلْسوڕاندنی کاروبارو بەرژەوەندی خۆی پەیوەندی لەگەلْ ئەو هۆزو خێلاّنە دەبەست کە لە ناوچەکەدا دیاربوون یان بەهێزبوون‌و ڕۆلْیان لە مەیداندا هەبووەو دەوری کاریگەریان لەبەرچاوبوو. گومان لەوەدا نییە کە لەو سەردەمەشدا جاف یەکێك بووە لە هۆزە گەورەو بەهێزەکان لە ناوچەکەدا بۆیە ئەو لایەنانەش زیاتر ڕوویان لەمان کرد [5].

زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە لقێکی کۆمەلْەی (ئیتیحادو تەرەقی) لە سلێمانیدا بە سەرۆکایەتی (مەحمود پاشای جاف) دامەزراوە، کە زۆربەی ئەندامەکانی لە ناحەزانی بنەماڵەی شێخ سەعید بوون، بەتایبەتی بازرگانو دەولْەمەندو ئەفسەرەکانی شاری سلێمانی لەم کۆمەلْەیەدا بوون بە ئەندام [6].

ناحەزانی شێخ سەعید لە پەنای ئەم ڕێکخراوەدا کەوتنە هەولْدان بۆ لێدانی شێخ سەعیدو کەمکردنەوەی دەسەلاتی [7]، بەلاّم لایەنگرانی بنەماڵەی کاك ئەحمەد لەو ڕۆژانەدا زۆربوون، حکومەت هەروابەئاسانی نەیدەتوانی کارێکی لەو جۆرە ئەنجام بدات. لەو ڕۆژانەشدا دەسەلاتدارانی تورك لە سلێمانی ناردبوویان بە شوێن مەحمود پاشای جافدا. مەحمود پاشاش بەخۆی‌و (300) سوارەوە ڕۆیشت بۆ سلێمانی. ئەم ڕۆیشتنەی مەحمود پاشا بەوشێوەیە بۆ ناو شاری سلێمانی، ئەو

---

[1] ـ ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: سەرچاوەی پێشوو، ل28.

[2] ـ هەمان سەرچاوە، ل29.

[3] ـ هەمان سەرچاوە، ل29ـ30.

[4] ـ م. ڕ. هاوار: شێخ مەحمودی، ب 1، ل202.

[5] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل225.

[6] ـ ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: شاری سلێمانی، ل31.

[7] ـ هەمان سەرچاوە، ل32.

گومانەی لەدڵی خەڵکیدا دروست کرد کە مەحمود پاشا بۆ ئەوە هاتووە یارمەتی حکومەت بدات بۆ ناردنی شێخ سەعید بۆ ئەستەمبولّ، لەکاتێکدا هەروەك (عەلادین سەجادی) باسی دەکات مەحمود پاشا بۆ ئەنجامدانی کارێکی لەو شێوەیە نەڕۆیشتبوو[1]،لە ئاکامدا شێخو ژمارەیەك لە براو کوڕەکانی دوورخرانەوە بۆ موسڵ[2]. دوای ناردنی شێخ سەعیدو بنەماڵەکەی بۆ موسڵ، بەپێی پیلانێکی بەرنامە بۆ داڕێژراو لەلایەن کاربەدەستانەوە لە ڕێکەوتی (1909/1/5)دا لە ئاژاوەیەکی دروستکراودا، شێخ سەعیدو شێخ ئەحمەدی کوڕیو ژمارەیەکی زۆر لە دەسو پێوەندەکانی کوژرانو شێخ مەحمود بە برینداری خۆی شاردەوە[3]. پاش گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ سلێمانی بۆ تۆڵەسەندنەوەی خوێنی باوکی، چ لە حکومەتو چ لەو کەسانەی کە بە بڕوای ئەو دەستیان لە کوژرانی باوکیدا هەبووە لەشاری سلێمانیو دەوروبەریدا هێزێکی زۆری لە لایەنگرانی بنەماڵەکەی کۆکردەوە بۆ ئەو مەبەستە.لەم کاتەشدا سەرلەنوێ حکومەت ناردی بەدوای مەحمود پاشادا بۆ ئەوەی بڕوات بۆ سلێمانی.

مەحمود پاشاش بەنزیکەی (600 تا 700) سوارەی جافەوە بەرەو سلێمانی بەڕێکەوت، سوارەکانی مەحمود پاشا کە زانییان پاشا بەنیازە بۆسلێمانی بڕوات، لەو سەردەمەشدا لەلایەکەوە پەیوەندی نێوان مەحمود پاشاو حکومەت زۆرباش نەبوو، لەلایەکی ترەوە شێخ مەحمودیش لەوێیە، دەیانزانی جاری پێشوو شێخ مەحمود ئەوەی لەدڵگرتبوو، کە ئەگەر مەحمود پاشا نەڕۆیشتایە بۆسلێمانی، شێخ سەعیدی باوکی نەدەنێردرا بۆ موسڵو لەوێ بکوژرێت. لەبەرئەوە شێخ مەحمود پێیوابوو لە کوشتنی شێخ سەعیدی باوکیدا دەستی هەبووەو پێویستە تۆڵەی لێبکرێتەوە. ئەم دەنگوباسانە لەناو سوارەکانی مەحمود پاشادا بڵاوبوبوەوە. بۆیە هەتا لە سلێمانی نزیك دەبوونەوە ژمارەی سوارەکانی مەحمود پاشا ڕووی لەکەمی دەکرد لەهەر قۆناغێکدا ژمارەیەك لە سوارەکان خۆیان لە مەحمود پاشا دەدزییەوە، تاگەیشتنیان بەشاری سلێمانی لە (600 تا 700) سواری جاف نزیکەی(60) سواریان مانەوە ئەوانەش لە پشتماڵەی مەحمود پاشا خۆی بوون. مەحمود پاشا پاش گەیشتنی ب مناو شار بۆ کەمێك پشوودان لە ماڵی (ئەوڕەحمان ئاغا) لایدا، دواتر بەخۆیو سوارەکانییەوە ڕوویکردە سەرا کە ئەودەم لەشوێنی دەبۆکەدا بوو.

کاتێك شێخ مەحمود هەواڵی گەیشتنی مەحمود پاشای بیست بۆناو شاری سلێمانی، بەخۆیو ئەوهێزەی کە کۆی کردبووەوە ڕوویکردە ناو شار بۆ کوشتنی مەحمود پاشا. سوارەکانی مەحمود پاشا لەترسی ڕوودانی شەڕ هەموویان فیشەکیان بردبووە پێشەوە، مەحمود پاشاشیان خستبووە نێوەڕاستی خۆیانەوە لەکاتی ڕۆیشتنیان بۆ سەرا.

لەوکاتەدا بەڕێوەبەری پۆلیسی سلێمانی (مەحمود خدری کوڕی خلەپەزە)بوو، پیاوەکانی مەحمود پاشا لەدەرەوە پاسەوانیان دەکرد، مەحمود پاشاش لەگەڵ مەحمود خدردا پێکەوە کۆبونەوەیەکی دووقۆڵییان بەست لەژوورەوە. هەر کە شێخ مەحمود ئەو هەواڵەی بیست بڕیاریدا پەلاماری سەرا بداتو دەستی بەسەردا بگرێت، لەولاشەوە مەحمود خدر ئەوەی لەبیرکرد کە ئەو بەرپرسێکی حکومییەو بەرپرسیارە لە ئاسایشی گشتی شارو گیانی دەمارگیریو هۆزایەتی زاڵبوو بەسەریدا، بۆیە دەڵێت : عەشرەت پشتی عەشرەت بەرنادات. فەرمانیدا بەپۆلیسەکانی سەرا کەبڕۆنە سەرسەربانی سەراکە. مەفرەزەکانی پۆلیسیش بەتفەنگەوە هەموو سەراکەیان تەنیو گرت، سوارەکانی مەحمود پاشاش دەوروبەری سەراکەیان گرت.

---

[1] ـ عەلادین سەجادی: ڕشتەی مرواری, ب6, ل262.

[2] ـ ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: سەرچاوەی پێشوو, ل32.

[3] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل32.

لەم کاتەدا پیاوماقوڵان‌و ڕیشسپییانی شاری سلێمانی بەقورئانەوە ڕۆیشتنە بەردەم شێخ مەحمودو داوایان لێکرد کە لەبەر خاتری (قورئان) دەست لەوکارە هەڵگرێت. سەراش لەپیاوانی خراپ قایم کراوە ئەگەر شەڕ ڕوو بدات خوێنێکی زۆر دەڕژێت، لەبەر ئەوە داوایان لەشێخ کرد بەو کارە نەبێتە هۆی ڕژانی خوێنی خەڵکانی بێتاوان‌و بارودۆخی سلێمانی سەرلەنوێ تێکنەچێتەوە. بۆیە شێخ مەحمود ئەو داوایەی ئەوانی قەبوڵکردو وازی لەوکارە هێنا. لەم سەروبەندەشدا، مەحمود پاشاو مەحمود خدر پێکەوە لە ژوورەوە دانیشتبوون، مەحمود خدر ڕوودەکاتە مەحمود پاشاو دەڵێت: "مەحمود پاشا ئەوکاتەی حەمە پاشای باوکتیان کوشت تەمەنت چەندبوو؟" مەحمود خدر دەیویست بەم قسەیە تانە لە مەحمود پاشا بداتو دڵی بریندار بکات. مەحمود پاشاش لەوەڵامدا دەڵێت : "جەنابی مەحمود خدر لەوکاتەی حەمە پاشای باوکم کوژرا تەمەنم(37) ساڵ بوو. بەڵام لەوکاتەی کە حەمە پاشای باوکم خلە پەزەی باوکتی کوشت تەمەنم (20) ساڵ بوو"[1]. لەدوای ئەوە مەحمود خدر ئیتر هیچ قسەی نەکرد، لەولاشەوە بەکشانەوەی شێخ مەحمود بارودۆخی شار ئارام بوویەوە، مەحمود پاشاش گەڕایەوە بۆ ماڵی ئەوڕەحمان ئاغا[2]. ئەو هەڵوێستەی مەحمود پاشا بەرامبەر بە شێخان بووە هۆی درێژەپێدانی ئەو ناکۆکیانەی کە بەر لەوە لە نێوان جافـو شێخاندا هەبووە[3].

بە شێوەیەکی گشتی دوو هۆکاری سەرەکی هەبوو بۆ تێکچوونی پەیوەندی نێوان جافـو شێخان:

**یەکەم:** خەڵکی ناوچەی عەربەت‌و شارەزوور خۆیان بە مورید و دەروێشی کاك ئەحمەدی شێخ دەزانی، عەشائیری جاف بەتایبەتی هۆزی (میکائیل) لە کۆچ‌و باری گەرمیان‌و کوێستانیاندا بە ناوچەی عەربەت‌و شارەزووردا تێدەپەڕین، لە ڕێڕەوی کۆچ‌و باردا مەڕو ماڵاتەکانیان زیانێکی زۆریان لە کشتوکاڵی ناوچەی عەربەت‌و شارەزوور دەدا، وا باوبوو لەو ڕۆژانەدا ئەو خاوەن زەوی‌و زارانە لە خاوەن مەڕو ماڵاتەکان دەپاڕانەوە کە نەیەڵن مەڕو ماڵاتەکانیان بکەوێتە ناو کشتوکاڵەکانیانەوە، لە وەڵامدا پێیان دەوتن: برام تۆ گاڵی خۆت وەگوێزە. خەڵکی شارەزوورو عەربەت لە ئەنجامی ئەو زیان لێکەوتنەدا پەنایان بردە بەر شێخ سەعید بۆ ئەوەی لای مەحمود پاشای جاف تکای ئەوەیان بۆ بکا کە سەرۆك عێلەکان ڕاسپێرن‌و فەرمان بدا ڕێگە نەدەن بە بەخشینی ئەو زیانە لە کاتی هاتوچۆی گەرمیان‌و کوێستاندا. شێخ سەعید بۆ ئەو مەبەستە نامەیەك دەنێرێ بۆ مەحمود پاشای جاف بە (حاجی سەید حەسەنی برای‌و سەید عەبدوڵلای کوڕی حاجی سەید حەسەن)دا، کە دەگەنە ئەوی‌ئۆ پاشا نامەکەی شێخ سەعید دەخوێنێتەوە، بە توڕەییەوە بە حاجی سەید حەسەن دەڵێت: "بڕۆ وە شێخ سەعیدی برات بێژە دەست نەخاتە ناو کاروباری خەڵکەوە، وەنوێژی خۆیەوە خەریك وێت".

---

[1] ـ (خلەپەزە)ی هەمەوەندی باوکی ( مەحمود خدر)، کە سێکی دیارو بەناوبانگی ناوچەکە بوو. لەو سەردەمەدا لەناوچەی ( مەیدان‌و هۆرێن‌و شێخان) دادەنیشت. لەسەر نفوس‌و دەسەڵات پەیوەندی لەگەڵ حەمە پاشای جافدا باش نەبوو. ڕۆژێك خلەپەزە لەنێو کۆڕی هەمەوەنددا دادەنیشێ‌و دەڵێت: ئەبێ ئەو حەمە پاشای جافە بگرم‌و بیهێنم سەری ببڕم‌و سەرو کەللەی بەڕیشە زلەکەیەوە هەڵواسم بەژێر سکی ماینەکەمدا.

ئەم قسەیەی خلەپەزە گەیشتەوە حەمە پاشای جاف کە لەوکاتەدا لە کوێستانەکانی (بس و مەولانا) بوو لە ناوچەی بانە، کە شوێن هەواری حەمە پاشا بوو, حەمە پاشاش فەرمانیدا نزیکەی (400) سواری جاف ئامادەکراو پاشان لەکوێستانی (مەولانا)وە بەرەو ناوچەی (مەیدان) بەڕێکەتن , لەبەرەبەیانی شەوێکی تاریکدا حەمە پاشا بەخۆی‌و سوارەکانیەوە دەدات بەسەر خلەپەزەدا, حەمە پاشا, خلەپەزە دەستگیر دەکات. پاشان خلەپەزەی سەربڕی‌و لاشەکەی هەڵدەدڕی‌و پڕی دەکات لەباروت‌و دەیدورێیتەوەو دواتر ئاگری تێبەردەدات, باروتەکەش دەتەقێتەوەو هەرپارچە گۆشتێکی (خلەپەزە) دەبات بەلایەکدا, پاشان حەمە پاشا سەری (خلەپەزە)ی بردو هەڵیواسی بەژێر سکی ئەسپەکەیدا , دواتر حەمە پاشا دەگەڕێتەوە بۆ هەوارگەی کوێستانی ( مەولانا) و دەڵێت: (خلەپەزە ) بەم شێوەیە سەری منی هەڵدەواسی بەژێرسکی ئەسپەکەیدا. (عەلادین سەجادی: ڕشتەی مرواری, ب6, ل261)

[2] ـ عەلادین سەجادی: ڕشتەی مرواری, ب6, ل262ـ264.

[3] ـ م. ڕ. هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب1, ل202.

حاجی حەسەن لە گەڕانەوەیدا بۆ سلێمانی، لە (خەراجیان)ەوە نامەیەك دەنێرێت بۆ شێخ سەعیدو وەڵامەكەی مەحمود پاشای پێدەگەیەنێت، شێخ سەعید تورە دەبێ‌و فەرمان دەدا بە خزمو دۆستانی لەناو عەشائیرەكاندا كە چەكدار كۆبكەنەوە، لە ناو ئەو چەكدارانەشدا هەندێ لە عەشائیری جاف بە پیریەوە دەچن (بە زۆری سمایلی‌و ڕۆغزایی‌و بێسەری كە هەموویان جاف بوون) لایەنگری شێخ بوون، كاتێك مەحمود پاشا بە هەواڵی ئەو چەكداركۆكردنەوەیەی شێخ سەعیدی زانی چاری نەماو بە ئاشتی‌و خۆشی كێشەكە لەگەڵ شێخ سەعیددا چارەسەر دەكات، بەڵام ئەم هەڕەشەیەی شێخ سەعید بوو بە گرێیەكی گەورە لە دڵی مەحمود پاشاو لایەنگرانیدا[1].

دووەم: سوڵتان عەبدولحەمید موچەیەكی تایبەتی بڕیبووەوە بۆ شێخ سەعید، ئەو موچە بە لیرەی ئاڵتون دەیدرایە، شێخ سەعید بەوە بووبوو بە پارەدار، لەو سەردەمەدا هەندێ لە تیرەو هۆزەكانی جاف كە سەر بە شێخ بوون، لەگەڵ ئەوەشدا كە لە عەشیرەتی جاف بوون، بەڵام مەحمود پاشا كە هەموو ساڵێك قۆتەراتی كۆدەكردەوە كە لە عوسمانییەكانی وەردەگرت، ئەو جافانەی كە سەر بە شێخان بوون گلەیی ئەوەیان لە مەحمود پاشا هەبوو كە باجی زیاتریان لێدەسێنێ، بۆ ئەوەی لەو ئەركەی پاشای جاف ڕزگاریان ببێت پەنایان بردە بەر شێخ سەعید، شێخ سەعیدیش بە پیری ئەو داخوازییەیانەوە ڕۆیشتە لای عوسمانییەكان‌و ئەو باجی مەڕوماڵاتی ساڵانەی لەسەر مەحمود پاشا زیادكردووەو هەر بەقەد ئەو پارەیەی قۆتەراتەی كە دابووی بە كاربەدەستانی عوسمانی، داوا لەوانە دەكات كە پارە كۆبكەنەوە، ئەوەی بەمجۆرەی دوایی داویانە زۆر كەمتر بووە لەوەی كە پێشووتر مەحمود پاشا لێی وەردەگرتن، بەوە مەحمود پاشا پارەیەكی زۆری ساڵانەی لە كیس دەچوو، لە ئەنجامی ئەوەدا لە شێخ سەعید دڵگیر بوو[2].

زێوەر لە (گەنجینەی مەردانا) باسی ئەوە دەكات كە چۆن لەگەڵ شێخ مەحمودو (30) سواردا بۆ سەرخۆشیكردن لە مەحمود پاشای جاف بەهۆی مردنی وەسمان پاشای برای چوونەتە هەڵەبجە، بەڵام وادیارە ئەو گرێیەی كە لە سەردەمی شێخ سەعیدی باوكی شێخ مەحموددا دروستبووە، وەكو باسمان كرد هەر لەدڵی مەحمود پاشای جافدا ماوەو دڵی لە شێخان پاك نەبووەتەوە[3].

وەك هەموو سەرچاوە مێژووییەكان دەری دەخەن، ئەو ململانێیە لەسەر دەسەڵات و سەرۆكایەتی لە نێوان بنەماڵەی بەگزادەی جافو بنەماڵەی شێخاندا پەیدابووە، بەتایبەتی لەسەردەمی شێخ سەعیدو شێخ مەحمودی كوڕیدا كە ویستوویانە دەست بەسەر هۆزی گەورەی جافدا بگرن‌و بیانكەن بەهێزێ بۆ پاڵپشتی دەسەڵاتی خۆیان. ئەمەش دوای ئەوەی بنەماڵەی شێخان دەسەڵاتی شێخایەتییان چەسپیوەو لەرووی ئایینیەوە ڕەگی خۆی داكوتاوە، ئەو ڕەگەش لەناو دڵ‌و دەروونی كۆمەڵگای كوردی ئەو سەردەمدا جێگیربووە، شێخان بوون بەخاوەن زەوی وزار[4].

ئەم هەڵوێستو دووبەرەكییە، خێڵەكییە، شتێكی لە قۆناغ بەدەرنەبوو، لەگەڵ سروشتی ئەو سەردەمەدا گونجاوە، بەڵام ئەم دووبەرەكییە نەگەیشتووەتە ڕادەی لەیەكتر ڕاپەڕین‌و شەڕو خوێنڕشتن[5]. كەواتە كێشەكە كێشەیەكی نەتەوەیی نەبووە، ئەوەندە هەیە هەردوولا چینی دەسەڵاتداری دەرەبەگیان هەبووە، ئەگەرچی ئەوانەی سلێمانی سیمایەكی

---

[1] ـ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب1, ل203ـ204.
[2] ـ هەمان سەرچاوە, ل204.
[3] ـ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب1, ل205.
[4] ـ كەریم بەگی فەتاح بەگ: سەرچاوەی پێشوو, ل 91ـ92.
[5] ـ هەمان سەرچاوە, ل92.

ئایینییان وەرگرتبوو کە شێخی بەرزنجەن، بەڵام ئەو سیمایە زاڵ نەبووە[1]. خودی مەحمود پاشا باوەڕێکی تەواوی بە ڕێبازی کوردایەتی هەبووە، سەرۆکەکانی جاف بەتایبەت مەحمود پاشا لەو بڕوایەدابوو ئەوەی دوای کێشەی کورد بکەوێ سەردەکەوێو سەرۆکایەتی میللەتی کورد دەگرێتە دەست[2].

سالآنی (1913ـ1919) دادەنرێ بە سەردەمێکی گرنگ لە ژیانی سیاسییانەی خەڵکی هەڵەبجەو هەموو ناوچەی شارەزووردا بەگشتی، چونکە لەو کاتانەدا (خانم) وەك سیاسییەکی ژن نەیارێکی سەرسەختی شێخ مەحمود بووە. کە لە ناوچەکانی (سنە)وە تا (قزرابات) حوکمی دەکرد، بەتایبەتی هەموو عێلی جاف ملکەچی بوون[3].

بەگزادەکانی جافـو حوکمڕانەکانیان بەتایبەتو عادیلەخان بەتایبەتیتر هەستیان بەوە دەکرد کە خانەدانو گەورەو بەگزادەن، بنەماڵەیەکن مێژوویەکی دێرینو ڕەسەنیان هەیە، خاوەنی دەسەڵاتێکی گەورەو کەسو پیاوو چەکدارێکی زۆر بەهێزن، کەوابوو ئەمانیش خاوەن کیانو بنکەی تایبەتنو مەڵبەندی خۆیان هەیە، ئیتر لەبەرچی لە ژێر دەسەڵاتو فەرمارەوایی شێخاندابن؟ بۆچی نەبنە خاوەن پلەو پایەیەکی سەربەخۆ؟[4].

لە تشرینی دووەمی 1918دا (مێجەر نۆئێل)و (مێجەر دانلیس) هاتنە سلێمانیو شێخ مەحمودیان کرد بە حوکمدار[5]، بەناوی حوکمداری کوردستانی باشوور، مێجەر نۆئێل بوو بە ڕاوێژکاری مەلەکی (شێخ مەحمود)و (مێجەر دانلیس) کرا بە معاونی جەنگی[6]. جگە لەوە نۆئێل ئیدارەی ناوخۆیی ناوەندەکانی (هەڵەبجەو چەمچەماڵو ڕانیە)ی پێکهێنا[7].

دەسەڵاتی یەکەم حکومەتی کوردستان (یەکەم حکومەتی شێخ مەحمود)، وەك ڕوون بووەتەوە، بەگشتی هەر لە ناوەندی سلێمانی و قەزاکانی ڕانیەو شارباژێرو هەڵەبجەو ناوچەکانی قەرەداغو سەنگاودا قەتیس بوو بوو، ئەم دەورە وەك (سدیق سالح) ئاماژەی پێ دەدا لە هەڵەبجە، حامید بەگی مەجید بەگی جاف قایمقامی هەڵەبجە بووە[8]، بەڵام ئەمە هێشتا جێگای مشتومڕی زۆرێك لە نوسەرانە، کە ئاخۆ لە سەردەمی یەکەم حکومەتی شێخدا حامید بەگ قایمقامی ئەو شارەبووە یان ئەحمەد موختاری مامی، هەرچەندە زۆرێك لەنوسەران ئاماژە بەوەدەدەن کە ئەحمەد موختار (1898–1935) لە دوای ڕووخانی یەکەم حکومەتی شێخو گەڕانەوەی ئینگلیزەگان بۆ هەڵەبجە کراوە بەقایمقامی شارەکە.

## دووەم: هەڵوێستی هەڵەبجە بەرامبەر شۆڕشی شێخ مەحمود

بێگومان گەورەترین کێشەی شێخ مەحمود دوای دامەزراندنی یەکەم حکومەتی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بریتی بوو لە دیاریکردنی سنووری جوگرافی کوردستانو نارۆشنی چەمکی وشەی حوکمدار[9]. کەسێکی وەکو نۆئێل زۆر لە هەوڵدا بوو بۆ کەمکردنەوەو نەهێشتنی ناکۆکییەکانی نێوان حکومەتەکەی خۆیو شێخ مەحمود[10]، لەکاتێکدا تەنانەت لە نێوەندە

---

[1] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل232.
[2] ـ کەریم بەگی فەتاح بەگ: سەرچاوەی پێشوو, ل90ـ91.
[3] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: لاپەڕەیەك لە, ل70 .
[4] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل232.
[5] میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی: حقائقی بەسەرهاتی شێخ مەحمود لە پەنای ئیستقلالی کورددا, سلێمانی, 2003, ل10 .
[6] ـ هەمان سەرچاوە, ل10.
[7] ـ عەبدورەقیب یوسف: مێجەر نۆئیل سەرنجێکی بارودۆخی کورد, و. سدیق سالح, سلێمانی, 2001, ل17 .
[8] ـ سدیق سالح: سەرچاوەی پێشوو, ل17 .
[9] ـ ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: سەرچاوەی پێشوو, ل 107.
[10] ـ هەمان سەرچاوە, ل106.

سیاسییەکانی بەریتانیاشدا بە چاوی گومانەوە لە (نۆئێل)یان دەڕوانیو بە لایەنگری کوردیان دەزانی [1]. هەر بۆیە نۆئێل لەلایەن (ولْسن)ەوە بانگکراوەو بە کارێك ڕەوانەی باکوری کوردستانی کراو (مێجەرسۆن) خرایە شوێنەکەی [2]، مێجەرسۆن هەر لەگەڵ دەستبەکاربوونیدا لە سلێمانی دەیویست دەسەلاتو نفووزی شێخ مەحمود کەم بکاتەوە [3]، سنووری فەرمانڕەواییەکەی کەم بکاتەوە. دیارە ئەوەش بۆ لاوازکردنو کەمکردنەوەی دەسەلاتی شێخ مەحمود بوو، ئەوەش مانای ڕێگاگرتنە لە یەکێتی کوردو یەکنەگرتنەوەی [4].

بە مەبەستی تاقیکرنەوەی توانای هێزەکانی خۆی، بەریتانیا دەسەلاتی شێخ مەحمودی فراوان کرد بۆ دەرەوەی سنووری سلێمانی، کە ئەمەش بوو بەهۆی سەرهەڵدانی تەنگو چەڵەمەو شێخ مەحمودی تووشی گێروگرفتی ڕووبەڕووبوونەوە کرد لەگەڵ سەرخێڵەکانی تری کورددا لە ناوچەکانی زاخۆو هەولێرو بەرزانو کەرکوكو پێنجوێنو هەڵەبجە. دژایەتیکردنی هەندێ لەو سەرۆك خێڵانە بۆ دەسەلاتدارێتییەکەی شێخ مەحمود زۆر توندوتیژ بوو کە یەکێك لەو حاڵەتانە دژایەتی جافەکانی هەڵەبجە بوو [5].

ئینگلیزەکان لەو ناچەی هەڵەبجەدا عادیلەخانی خێزانی عوسمان پاشای جافیان لە شێخ مەحمود ڕاستکردەوە، ناوبراو خۆی لەگەڵ شێخ مەحمودا هێندە تەبا نەبوو، بەم شێوەیە دەسەلاتی شێخ مەحمودیان لە هەڵەبجەو دەوروبەریدا کزکرد [6]، تا کار گەیشتە ئەوەی جافەکان داوای ئەوەیان کرد کە لە دەسەلاتی شێخ مەحمود جیابکرێنەوە بۆ ئەم مەبەستەش ئینگلیزەکان ئەفسەرێکی خۆیان بەناوی (لیز)ی فرۆکەوان ناردە هەڵەبجە بۆ ئەوەی کاروباری ئەوێ بەڕێوە ببات [7].

لە کۆتایی نیسانی 1919دا حاکمێکی سیاسی بۆ جاف دروستکراوو نێردرایە هەڵەبجەو ناوچەی جافایەتی، بەوشێوەیە هەڵەبجە لە دەسەلاتی شێخ مەحمود جیاکرایەوە بۆ ئەوەی کە قەڵەمڕەوی فراوان نەبێت [8].

بێگومان مێجەرسۆن هەر لە خۆیەوە ئەو ئەفسەرەی دانەناوە بۆ هەڵەبجە، سۆن لەڕاپۆرتێکی نهێنیدا کە لە ساڵی 1919 ناردویەتی بۆ کاربەدەستانی باڵای وڵاتەکەی لە بەغداد، باسی ئەوەی کردووە کە لە کۆبوونەوەیەکیدا لە (کەلار) لە کەناری ڕووباری سیروان بەئیجازەی حاکمی گشتی مەدەنی لەبەغداد ئەفسەرێکی تەقدیمی جافەکان کردووە کە ناوی (o.p. a) بووە (هەرچەندە ناوی نەهێناوە بەڵام مەبەستی لیزە)، جافەکانیش پێشوازیان لەو ئەفسەرە کردو هەموویان ئیخلاصی خۆیان بەرامبەری دەربڕیووە [9].

شێخ ڕەئوفی کوڕی شێخ مەحمود باس لەوە دەکات، بەر لەوەی مێجەرسۆن بێتە سلێمانیو جێگای نوئێل بگرێتەوە، هەموو شەوێك یەکێك هاتووەتە لای باوکی، هەرجارێکیش کە دەهات یا عەبدوڵا ئاغای حاجی حەمە سەعید، یاعەبدوڵا ئاغای چاوشی لەگەڵدا بوو، کە ناوی ئەو کەسەم پرسی وتیان ناوی (سدقی فاتە شەل)ە، سدقی پیاوێکی کەڵەگەت بوو،

---

[1] ـ هەمان سەرچاوە, ل 108.

[2] ـ هەمان سەرچاوە, ل 109.

[3] ـ قادر حەمەجان عزیز: چەمکێك لە خەباتی کورد لە خوارووی کوردستاندا, گۆڤاری(سلێمانی), ژ (6), 2000, ل15.

[4] ـ هەمان سەرچاوە, ل 15.

[5] ـ نادر ئینتسار: ئیتنۆ نەتەوایەتی کورد, و. عەتا قەرەداغی, چاپخانەی (تیشك), سلێمانی, 2004, ل113.

[6] ـ ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: سەرچاوەی پێشوو, ل113.

[7] ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب1, ل470:سدیق ساڵح: حکومەتی کوردستان(1918ـ1924), سلێمانی, 2003, ل21.

[8] ـ میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی: سەرچاوەی پێشوو, ل11.

[9] ـ بەوەرگرتن لە ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب1, ل448 .

کرابوو بەهەمزەی وەسڵ لەنێوان شێخو ئەفسەرە کوردەکاندا، دوای ئەوەی مێجەرسۆن شوێنی نۆئێلی گرتەوە، هاتوچۆی ئەو ئەفسەرانەی بۆ لای شێخ قەدەغەکرد، بەو هاتوچۆیەی شەوانەی سدقی زانیو گواستیەوە بۆ هەڵەبجە، زۆری پێنەچوو لەلایەن (عەلی بەگی ڕیشێن)[1] ەوە لەبەردەمی چادرەکەی خۆیدا کوژرا.

شێخ ڕەئوف باسی ئەوەی کردووە، کە لیز لە کتێبەکەی خۆیدا ( دووساڵ لەکوردستان) دانی بەوەداناوە کەعەلی بەگ ڕزگاری کردووە لەسدقیو وتویە سدقی سەر بە شێخ مەحمود بووەو دژی ئێمە بووە. بڕیاربووە کە سدقی، من (لیز) بگرێو بمداتە دەست مەحمود خانی دزڵی. ئەوەشی وتووە کە ئەو هیچ پەیوەندی بەوکوشتنەی (سدقی)یەوە نەبووە، بەڵکو عەلی بەگ هەر لەخۆیەوە کوشتوویە، بەڵام شێخ ڕەئوف ئەو قسەیەی لیز بەڕاست نازانێ، چونکە عەلی بەگ سدقی نەناسیووە، نەشبیسترابوو پێشتر هیچ ناکۆکیەك لەنێوانیاندا ڕوویدابێ، بۆیە شێخ رەئوف پێیوایەکە سدقی بەپێی ڕاسپاردەو پیلانی مێجەرسۆنو بەئاگاداری لیز کوژراوە[2].

هاوکات لەناو شاری سلێمانیشدا، تا دەهات ناکۆکیەکانی نێوان شێخ مەحمودو مێجەرسۆن زیاتر پەرەی دەسەند[3]، شێخ مەحمود لەلای خۆیەوە هەستی بەوە دەکرد کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەستکەوتەکانی لەدەستدەدا، لەبەرئەوە بۆ هەڵگیرساندنی ڕاپەڕینێکی گشتی هەلی قۆستەوە. زۆربەی ئەندامانی بنەماڵەی بەرزنجەو لایەنگرانیان لە هۆزەکانی هەمەوەندو جاف، هەروەها چەکدارە هەورامییەکانی ئەوبەری سنووری ئێران بەشداری ئەو ڕاپەڕینەیان کرد[4].

ئەمەو لە (مایسی 1919)دا، شێخ مەحمود هەواڵی ناردبوو بۆ مەحمود خانی دزڵی[5] کە بە ناوی زیارەتی (کاك ئەحمەد)ەوە بە لەشکرەوە بێت بۆ سلێمانی[6]، مەحمود خانیش بە لەشکرێکی کۆکەوە خۆی گەیاندە ناو شار، پاشان لە (21 مایسی 1919)دا ڕاپەڕین بە هەموو مانایەك سەریهەڵداو ئەو کاربەدەستە ئینگلیزانەی کە لە سلێمانی بوون گرتنیو شۆڕشی خۆی بەرامبەر بە ئینگلیزەکان ڕاگەیاند، هەمان کات لایەنگرانی شێخ بەتایبەتی جافەکانی سەر بە حامید بەگ، ئابلۆقەی هەڵەبجەیانداو (لیز)ی یاریدەدەری کارگێڕی سیاسییان لە دەورویەری شار دابڕی[7].

مێجەرسۆن، دەڵێت: "کە مەحمود خان ویستی بێت بۆ سلێمانی، لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی ئەفسەری سیاسیمانەوە لە هەڵەبجە ئاگادار کرابوو کە ڕێگای لێناگیرێ بێتە سلێمانی، بە مەرجێك خۆیو پیاوەکانی بەچەکەوە نەیەن، بەڵام گوێی

---

[1] ـ عەلی بەگی ڕیشێن کوڕی ئەحمەد بەگی ڕیشێنە, ئەحمەد بەگ کچێکی عادیلەخانمی هێنابوو, بەڵام عەلی بەگ لەوکچەی خانم نەبووە, بەڵکو لەژنێکی تری بووە. لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا لە هەڵەبجە کوژراو کوشتنەکەشی ونکرا کە بەهۆی نارێکی ناوخۆی جافەکانەوە کوژرابوو. (ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو,ب1, ل439), بەم دواییانە لەیەکێك لەپیاوە بەتەمەنو ناودارەکانی شاری هەڵەبجەم پرسی وتی: عەلی بەگ لەلایەن باسامی ئێرانی کەخزمەتکاری ماڵی حامید بەگ بوولەماڵەکەی خۆیداو لەسەرحەوزەکەی ماڵەوەیان تەقەی لێکراو کوژرا, باسام ئەو کارەشی لەسەر ڕاسپاردەو داوای (ح) ئەنجام دابوو.

[2] ـ بەوەرگرتن لە: ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو,ب1, ل438ـ439.

[3] ـ ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: سەرچاوەی پێشوو, ل113.

[4] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو, ل55ـ56. د. کەمال مەزهەر: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل223.

[5] ـ مەحمود خانی دزڵی کوڕی(عەزین) ی کوڕی (بارام بەگ) ە ساڵی 1870ز لەئاوایی دزڵی لەناوچەی هەورامانی تەخت لەدایك بووە. ( ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب1, ل217 )

[6] ـ عەلادین سەجادی: مێژووی ڕاپەڕینی کورد, چ2, ئینتیشاراتی محمدی, سەقز, 1996.

[7] ـ د. کەمال مەزهەر: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل36.

نەدایەو بە چەکەوە هاتە سلێمانی"[1]. بەم شێوەیە ڕاپەڕینی یەکەمی شێخ مەحمود لە ئەنجامی هەستکردنی بوو بە نەخشەی ئینگلیزەکان بۆ هێنانە خوارەوەی پلەوپایەی خۆی‌و دەسەڵاتدارێتییەکەی[2].

سۆن بەر لە گەیشتنی مەحمود خان بۆ ناوشار، (گرینهاوس)ی کرد بە جێگری خۆی، خۆی بە سەیارە گەیاندە کەرکوك (21 مایسی 1919)[3]. بەڵام شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحمود دەڵێت : "لەم کاتەدا مێجەرسۆن بەرەو شارەزوور هەڵهاتووە، چونکە پێی وابوو بەگزادەکانی جاف لەهەڵەبجە لەگەڵ شۆڕشەکەی شێخ مەحموددا نین‌و، یارمەتی ئەم دەدەن. بەڵام پێش ئەوەی بگاتە هەڵەبجە هەواڵی گرتنی (گرینهاوس)ی پێگەیشت، لێرەدا مێجەرسۆن بێ هیوا بوو، بۆیە بەناچاری بەرەو بەغداد هەڵهات"[4]. پێش ئەم هەرایە خەتی کەرکوك بڕابوو، لەبەر ئەوە هەواڵی شۆڕش‌و گرتنی سلێمانی لەڕێگەی هەڵەبجەو خانەقینەوەو دوای دوو ڕۆژ گەیشتە بەغداد. وڵسن بە فڕۆکە هاتە سەر سلێمانی‌و بەسەر دەبۆکەدا گەڕاو بڵاوکراوەیەکی بۆ شێخ خستەخوارەوە، داوای ئەوەی لێکرد کە بۆ چاوپێکەوتنی وڵسن‌و گفتوگۆ بچێتە بەغدا. بەڵام شێخ مەحمود بەهۆی ئەو ئینگلیزانەوە کە لە دەبۆکە گیرابوون، هەندێ مەرجی دانا بۆ ئەم چاوپێکەوتنە کە دەستی نەئەدا بۆ وڵسن[5]. دوای ئەوە وڵسن ڕۆیشت بۆ هەڵەبجە بۆ ئەوەی ئەفسەری سیاسی (لین) لەگەڵ خۆیدا ببات، بەڵام لەبەر نەبوونی بەنزین لە فڕۆکەکەیدا هەروەك خۆی باسی کردووە نەیتوانی ئەو کارە ئەنجامبدات، ئەوەی کەتوانی بۆ لیزی بکات، ئەوەبووە کە لەئاسمانەوە نامەیەکی بۆ خستەخوارەوە داوای لێکرد لەوناوەدا نەمێنێت‌و خۆی دەربازبکات[6]، دوای ماوەیەك توانی بە یارمەتی خانمی وەسمان پاشا خۆی ڕزگار بکات‌و خۆی بگەیەنێتە خانەقین، (خانم)یش لە پاداشتی ئەم خزمەتەدا بوو بە (خان بهادر)[7]. بەوشێوەیە ئەفسەری سیاسی لەهەڵەبجە مولازمی فڕۆکەوان (lees.m .g) توانی خۆی لەهەڵەبجە دەرباز بکات بەرلەوەی شۆڕشگێڕەکان لە (1919/5/26)دا بنکەکەی داگیربکەن. هەڵەبجە لەو ڕۆژانەدا لەلایەن حامید بەگی جاف‌و باقی لایەنگرەکانی تری سەر بە شێخ مەحمودەوە دەستی بەسەردا گیراو لە دەسەڵاتی ئینگلیز پاککرایەوە، هەرچەندە هەندێك دەڵێن هەڵەبجە لەلایەن هەورامیەکانەوە دەستی بەسەردا گیراوە، لەوانە ( وڵسن‌و ڕەفیق حیلمی....هتد)[8]، بەڵام لەڕاستیدا ئەوە هەورامیەکان نەبوون ئەو کارەیان کرد، بەڵکو حامید بەگ‌و لایەنگرەکانی تری شێخ مەحمود بوون لەو شارە هەستان بەگرتنی شارەکە[9]،حامید بەگ لەلایەن شێخ مەحمودەوە بۆ ئەو کارە ڕاسپێردرابوو.

عادیلە خانم هەڵسوڕێنەری کاروباری بنەماڵەو هۆز بوو، لەو سەردەمەدا کە ئێمە مەبەستمانە (یەکە پیاو)و دەمڕاستی هۆزەکە بووە، هەر ئەویش هێڵی سەرەکی‌و ڕێچکەی دەستنیشان دەکرد کە دەبوایە پەیڕەو بکرایە، هەڵبەتە ئەویش بەرژەوەندی بنەماڵەو هۆزەکەی لە پێش هەموو شتێکەوە داناوە[10].

---

[1] - ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل146.

[2] - قادر حەمەجان عەزیز: سەرچاوەی پێشوو,ل15.

[3] - ڕەفیق حیلمی: یادداشت, چ3, سلێمانی,2003, ل81.

[4] - شێخ لەتیفی حەفید: سەرچاوەی پێشوو, ل54.

[5] - ڕەفیق حیلمی: سەرچاوەی پێشوو, ل81.

[6] - بەوەرگرتن لە: ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب1, ل495 .

[7] - ڕەفیق حیلمی: سەرچاوەی پێشوو, ل82. فؤاد حمه خورشيد:العشائر الكردية, بغداد, 1979, پ39, ص78.

[8] - بڕوانە ڕەفیق حلمی: یادداشت, چ3, سلێمانی, 2003, ل82. ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب1,ل 514 .

[9] - د.کەمال مەزهەر: چەندلاپەڕەیەك لە, ب2, ل36. کاسێتێکی بڵاونەکراوە کەبریتییە لەچاوپێکەتنێك لەگەڵ حاجی عەبدولقادری عەبابەیلێ, 2001/1/24, هەڵەبجە .

[10] - عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل224.

بەگزادەکانی جاف لەو کاتەدا (1919) لە هەڵەبجەدا لە ڕووی هەڵوێستی سیاسییەوە دابەش بووبوون بەسەر دوو گرووپدا:

1- گرووپی یەکەم بە سەرۆکایەی عادیلەخان (خێزانی وەسمان پاشا)و هەردوو کوڕەکەی (عیزەت بەگو ئەحمەد بەگ)و خانەوادەی مەحمود پاشا بوون. ئەم باڵە ناکۆك بوون لەگەڵ شێخ مەحمودو ئامانجە نەتەوایەتییەکانی [1]، پشتیوانێکی پتەوی هێزی داگیرکەری بەریتانی بوون لەهەردوو ناوچەی سلێمانیو گەرمیاندا، سوارەکانیان لە خزمەتی بەریتانیا بوون هەرکاتێك داوایان بکردایە، هەوالگریکی زۆریان کۆکردبووەوە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر هێزە خێڵەکییەکانی شێخ مەحمودو پشتیوانەکانی [2]، خەڵکی عەشایەرو جەماوەری هەڵەبجە بە دڵ لەگەڵ شێخ مەحمودو شۆڕشەکەیدا بوون، بەڵام لە ترسی خانم کەس نەیدەوێرا ئەوە بدرکێنێ، چونکە خانم چاوساغی خۆی لە هەموو جێگەیەك بڵاوکردبووەوە، لەلایەکی ترەوە کاغەزو نووسراوی بۆ هەموو سەرۆك هۆزو عەشرەتەکانی شارەزوور ناردبوو کە پشیوانی لە شێخ مەحمود نەکەن، لە ڕاستیدا خەڵك لەو کاتەدا نەیدەتوانی ئەوەی ئەیەوێ بیکات، چونکە بڕیارو هەڵوێست وەرگرتن تەنها مافی سەرۆك عێلو گەورە پیاوان بوو [3].

2- گرووپی دووەم بە سەرۆکایەتی حامید بەگی کوڕی مەجید بەگی عوسمان پاشا (لە ژنی یەکەمی عوسمان پاشا) [4]، لەگەڵ داود بەگی کوڕی حەمە سەعید بەگی ئامۆزایدا بوو. ئەمانە پشتیوانی شێخ مەحمود بوونو دژایەتی بەریتانیای داگیرکەرو لایەنگرانیانو سیخوڕەکانیان لە ناوچەکەدا دەکرد تێبینی ئەوەش دەکرێت هەردوو هەڵوێستەکە گشتگیر ناکرێت لەسەر تەواوی تاکەکانی عەشیرەتەکەو لقەکانیان، هەروەك چۆن ئەم قسەیە بۆ نەوەکانیشیان ڕاستە [5].

هەڵوێستی جاف لەو سەردەمەدا هەروەك د.عیزەدین مستەفا ڕەسولْ باسی دەکات بەرامبەر بە شێخو شۆڕشەکەی هەروەکو پشدەرو هەمەوەندو زۆر عەشیرەتی تری کوردو تەنانەت (سادات) خۆشیان دوو بەرە بوون [6].

بۆیە لە ناوچەی هەڵەبجەدا، جگە لە دوو کەسایەتی کە ئەوانیش (سەید قادرو باوە موفتی) بوون کەس نەیدەتوانی نەیاری ئاشکرای سیاسەتەکانی (خانم) بێت، ئەو دوانەش لە پاشاندا گیرانو بەرەو سەربازگەی ئینگلیز لە نزیك گوندی (باوەکۆچەك)ی هەڵەبجە ڕاپێچ کران، بەڵام لە دەوروبەری شاردا خانم نەیاری زۆربوو، گرنگترینیان (شێخ ڕەشیدو شێخ کەریمی عەبابەیلیۆ مەحمود خانی دزڵیو حەمەی سان ئەحمەدی شەمێران) بوون. ئەوکات هەریەکە لەمانە خاوەن دەسڵاتێکی گەورەو پیاوێکی زۆریان لە دەورویشت بوو، لەگەڵ دەستپێکردنی شۆڕشەکەی شێخ مەحموددا ئەمانیش جاڕی پشتیوانی خۆیانیان بۆ شێخ داو هەڵوێستیان وەرگرت، بێگومان خانمیش لە ئاست ئەم بگرەو بەردەدا دەستەوسان ڕانەوەستابوو، بەڵکو هەموو توانایەکی خۆی خستەکار هەتا هێمنی ناوچەکە بپارێزیو نەهێڵێ تووشی جەنگو پێکدادان

---

[1] ـ ئەگەر شێخ مەحمود بەلایەوە شۆڕش هەڵگیرسان کارێکی دروست بوویێ بۆ بەدەستهێنانی خواستی گەلەکەی, ئەوا ڕەنگبێ بەگزادەکانی جاف بەشێکیانو دەسەڵات بەدەستەکان پێیانوابوو (پشت بەستن بەهێزیکی گەورە- ئینگلیز) تاقەڕێگای ڕاستەو بەوشێوە دەتوانرێت مافی گەلەکەی دابین بکرێت وکۆمەلانی خەڵکو ناوچەکەش دووردەبن لەکارەساتی جەنگو دەردەسەریو ماڵوێرانی.(عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل233)

[2] ـ فؤاد حمەخورشيد: العشائر الكرديه, ص77. د.مكرم الطالباني, حزب هيوا, سلێمانی, 2002,ص23.

[3] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: لاپەڕەیەك لە, ل65.

[4] ـ ژنی یەکەمی عوسمان پاشا ناوی (مەنیجەخان) بووە کەلە بەگزادەکانی هەورامان بووە. بڕوانە (عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل23), بەڵام ئیدمۆندز دەڵێ ناوی(نەوسودخان) بووە.(ئیدمۆندز:سەرچاوەی پێشوو,ل191)

[5] ـ فؤاد خورشيد: مصدر السابق, پ39, ص78.

[6] ـ د.عیزەدین مستەفا ڕەسولْ: دیوانی ئەحمەد موختار جاف, ل20.

ببێت، بۆیە لە زۆر هەڵوێستو لە چەندەها بۆنەدا پیشانی خەڵکی دەدا کە چەند بەهێزەو لە چاوساغی کردن بۆ ئینگلیزەکان درێغی نەدەکرد[1] .

عادیلەخان بە نیازی پاراستنی هەڵەبجە پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیزەکان بەستو هاوکاری دەکردن، بەڵام هۆزەکانی ناوچەی هەڵەبجە ئەو کارەیان بەلاوە پەسەند نەبوو، کەوتنە ململانێ لەگەڵ ئینگلیزو ملیان بۆ خانم نەدەدا[2] .

ئەم بارودۆخە زۆری نەخایاند، ئەوە بوو لە (1918/11/1)دا حکومڕانی یەکەمی شێخ مەحمود دەستی پێکرد تا حوزەیرانی 1919 بەردەوام بوو، ئەوەبوو شەڕەکەی دەربەندی بازیان لە (17/حوزەیران/1919) کۆتایی بەو فەرمانڕەواییە هێناو شێخ بە بریندارى گیراو لەلایەن دادگایەکی ئینگلیزەوە لە بەغداد فەرمانی خنکاندنی درا، دواتر گۆڕاو بۆ بەندی هەمیشەیی‌و دواجار گۆڕا بە فەرمانی دوورخستنەوەی بۆ هیندستان[3] .

ئەحمەد خواجەو ڕەفیق حیلمی‌و زۆرێکی تر لە نووسەران باسی ئەوەیان کردووە کە عیزەت بەگ[4](1895–1945) یەکێك بووە لەو حەوت کەسەی کە ئینگلیزەکان بردونیان بۆ بەغدا بۆ ئەو دادگایەی کە شێخ مەحمودی تیادا دادگایی کرا، بۆئەوەی شایەتی بدەن دژی شێخ مەحمود[5] .

لە سەروبەندی شەڕی دەربەندی بازیاندا مەحمود پاشای جاف دوو نامەی نوسی‌و دای بە شێخ سەلامی شاعیر بۆ ئەوەی بیبات بۆ شێخ مەحمودو حاجی سەید عومەری مامی. کاتێك شێخ سەلام دەگاتە سلێمانی شێخ مەحمود لە دەربەندی بازیان دەبێت، شێخ سەلام نامەکەی مەحمود پاشای گەیاندووەتە دەستی شێخ مەحمود، بەڵام باسی ناوەڕۆکەکەی نەکردووە سەبارەت بە چی بووە. لە پاش یەك دوو ڕۆژ لە گەیاندنی نامەکەی مەحمود پاشا بە شێخ مەحمود، شێخ مەحمود لەلایەن ئینگلیزەکانەوە گیراو شێخ سەلامیش بەپەلە خۆی دەربازکرد، پاش گرتنەوەی سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە، خۆی گەیاندووەتە ناوچەی قەرەداغ. دواتر شێخ سەلام ئەم هەواڵو دەنگوباسانە بۆ مەحمود پاشا دەگێڕێتەوە، مەحمود

---

[1] ـ بەکرحەمەصدیق: لاپەڕەیەك لە,ل66ـ65.

[2] ـ کەشکۆڵ: هەڵەبجە لەهەڵدێری مێژوودا, گۆڤاری(خەرمانە), ژ(8), 1993, ل4.

[3] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل229ـ228.

4 ـ عیزەت بەگ کوڕی وەسمان پاشای کوڕی حەمە پاشایە , دایکیشی عادیلەخانە کە یەکێکە لەژنە ناودارەکانی کورد. لەکۆتایی ساڵی 1895دا لەهەڵەبجە لەدایك بووە, بەحوکمی ئەوەی باوکی پیاوێکی خاوەن دەسەڵاتو خاوەن سامان بووە, هەر لە منداڵییەوە مامۆستای تایبەتی بۆگیراوە, جگە لەو بابەتانەی کە لەوسەردەمەدا فێری فێرخوازان کراوە, زمانی فارسی‌و تورکی‌و ئینگلیزیش فێرکراوە. دواتر لەسەر ڕاسپاردەی باوکی ڕۆیشتووە بۆ سلێمانی بۆ سەرپەرشتی کردنی ئەو موڵکانەی کە لەدەوروپشتی ئەو شارەدا هەیان بوو، بەتایبەتی لەئاویارەو بەکرەجۆ, جگە لە قەیسەری‌و موڵکەکانی تریان لەناو شاردا, خانویەکی گەورەشیان لەسلێمانی هەبووە. لەساڵی 1923 بۆماوەی چەند ڕۆژێك بووە بە سەرۆکی شارەوانی سلێمانی. عیزەت بەگ لەگەڵ زۆرێك لە بنەماڵە ناودارەکانی شاری سلێمانیدا پەیوەندی هەبووە. ئەگەرچی عیزەت بەگ خۆی شاعیر نەبووە، بەڵام زۆر حەزی لەشیعرو ئەدەبیات کردووە, ماڵەکەی ببووە شوێنی کۆبونەوەی شاعیرانو نوسەرانو ئەدەب دۆستان, بەتایبەت لەوکاتانەی کەجارجار ئەحمەد موختار جافی شاعیری برای سەردانی سلێمانی دەکردو لە ماڵی عیزەت بەگ دەمایەوە. عیزەت بەگ لە خولەکانی هەشتەم (1937/12/23ـ1939)و نۆیەم (1939/6/12ـ1943/6/9)و دەیەم (1943/10/9ـ1946/5/31)ی پەرلەمانی عێراقدا ئەندام بووە وەکو نوێنەری شاری سلێمانی. تا لە ڕۆژی (1925/5/1) کۆچی دوایی کردووەو لە (گردی حاجی عەولای گەورە) لە تەنیشت (حەفسەخان)ی خێزانیەوە نێژراوە. (عبدولخالید صابر: سەرۆك شارەوانیەکانی سلێمانی (1890ـ2003), سلێمانی, 2003, ل59ـ61 . عبدالرزاق الحسنی: مصدر السابق, ج10,ص299ـ303)

[5] ـ ئەحمەد خواجە: چیم دی, ب 1, چاپخانەی شەفیق, بەغدا, 1968, ل53ـ54 .

پاشا زۆر بەپەرۆشەوە پرسیاری ئەوەی لێدەکات کە ئایا شێخ مەحمود کوژراوە یان بریندارە؟ شێخ سەلامیش پێی دەڵێ کە شێخ بریندارەو گیراوە. مەحمود پاشاش وتوویەتی: "شێخ مەحمود بوو بە پیاوێکی گەورەو هاورێ ئێمەمانان نییە"[1].

ولّسن خۆی باس لەوە دەکات کە شەش هەفتەی یەکەم دوای گەڕانەوەیان، سەرقاڵی سزادانی شۆڕشگێڕان بوون تەنها بەناو سلێمانییەوە نەوەستان، بەڵکو کەوتنە کێومالّی پانتاییەکی فراوانی هەرێمی سلێمانی. ژمارەیەك لە هێزەکانیان بەرەو هەڵەبجە ڕۆشتوون[2]، (ئیدمۆندز)یش باس لەوە دەکات کە ڕۆژی 16/حوزەیران، کاروانێکی سەربازی لە خانەقینەوە هاتو بە شێوی سیروانیدا تێپەڕیو لەگەڵ کاروانێکی دیکە کە لە سلێمانییەوە چوویوو، هەڵەبجەیان گرتەوەو (لین)یان سەرلەنوێ لە شوێنی خۆی داناوە[3]. هاوکات سوپایەکی گەورەی ئینگلیز ئۆردوگایەکی سەربازی گەورەی هەڵدا لە نزیك گوندی (باوەکۆچەك)، کە لەوێوە دەڕوانێ بەسەر هەڵەبجەدا[4].

## شەڕی دەربەندی ئەشکەوڵ

دوای هاتنەوەی ئینگلیزەکان بۆ هەڵەبجە، دیسان هەڵەبجە دابەشبوو بۆ دوو بەش:

1- بەگزادەی ئەحمەد بەگی (ئەحمەد موختار) کە زۆربەی نەورۆڵییەکان پشتگیرییان دەکرد.

2- بەگزادەی (حامید بەگ) کە زیاتر شێخانی عەبابەیلێ (بەتایبەتی شێخ کەریمو شێخ ڕەشید) لەگەڵ هەندێ لە هاوارییەکان پشتگیرییان دەکرد لەسەرەتاوە.

دوای گەڕانەوەی ئینگلیزەکان بۆشارەکە (ئەحمەد موختار جاف) کرا بە قایمقامی هەڵەبجە لەلایەن ئینگلیزەکانەوە، لەبەرامبەردا حامید بەگو داود بەگی ئامۆزایو خەڵکانی تری لایەنگری شێخ مەحمود لە هەڵەبجە بەتایبەتی شێخانو بۆرە پیاوانی عەبابەیلێ کە بەشداری شۆڕشەکەی شێخیان کردبوو، بەتوندی دژی گەڕانەوەی دەسەلاتی ئینگلیزەکان بوون بۆ هەڵەبجە. پێشترو لەکاتی بەرپابوونی شۆڕشەکەی شێخدا زۆربەی ناوچەکان لەژێر دەسەڵاتی ئەحمەد موختارو ئەو خەڵکانەی کە لەو سەردەمەدا لەشارەکەدا لایەنگری ئینگلیزەکان بوون دەرچوویوون، بۆیە (ئەحمەد موختار جاف و ئەحمەد بەگی ڕیشێن)[5] بە شێوەیەکی نهێنی لەگەڵ ژمارەیەك لە لایەنگرەکانیاندا هەڵەبجەیان بەجێهێشتو ڕۆیشتن بۆ بەغداد، دوای ئەم ڕۆیشتنەی ئەحمەد بەگ، حامید بەگی جاف بوو بە لێپرسراوی یەکەم لەشاردا بۆ ماوەیەکی کەم[6]. پێشتریش هەردوو ناوچەی هاوارو عەبابەیلێ ئامادەنەبوون کە باجو سەرانە بدەنە ئینگلیزەکان، بۆیە (کاپتن لین) فشاری خستە سەریان، لە عەبابەیلێ (شێخ ڕەشیدو شێخ کەریمو شێخ عەبدوڕەحمانو ئەحمەدی حەمە چاوڕەشو مەحمودی یاسە)، لە هاواریش (سەید مورادو وەستا تۆفیق) لەگەڵ چەند کەسێکی تردا کە لەگەڵیان بوون، بڕیاریاندا کە ئەگەر ئینگلیزەکان هاتنە سەریان بە شەڕ وەڵامیان بدەنەوە، هەرچەندە هەندێ کەس ترسیان هەبوو لە کاردانەوەی ئینگلیزەکان، بەڵام ئەوان لەسەر بڕیاری خۆیان سووربوونو گوێیان بە هیچ شتێك نەدا[7].

---

[1] - کەریم بەگی فەتاح بەگ: سەرچاوەی پێشوو, ل91.

[2] - بەوەرگرتن لە: ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: سەرچاوەی پێشوو, ل121. سدیق ساڵح: سەرچاوەی پێشوو, ل39.

[3] - ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو, ل80. سدیق ساڵح: سەرچاوەی پێشوو, ل38.

[4] - بەکر حەمەصدیق عارف: لاپەڕەیەك لە, ل66.

[5] - ئەحمەد بەگی ڕیشێن لەسەرەتاوە لەگەڵ ئینگلیزەکاندا بوو, بەڵام دواتر بووبەیەکێك لە دوژمنە سەرسەختەکانی ئینگلیز هەروەك دواتر باسی دەکەین.

[6] - کاسێتێکی بڵاونەکراوە کە بریتییە لەچاوپێکەوتنێك لەگەڵ (حاجی عەبدولقادری عەبابەیلی), 2001/1/24, هەڵەبجە.

[7] - حەکیم مەلا ساڵح: سەرچاوەی پێشوو, ل268-269.

پاش ماوەیەك (5) فڕۆكەی ئینگلیز لە بەغدادەوە هاتنە سەر ناوچەكە، هاتنی ئەم فڕۆكانە بووە جێگای سەرسوڕمانی خەڵكو هیچ كەس لە نهێنی هاتنی ئەو فڕۆكانەی نەدەزانی، كە بۆ چ كارو مەبەستێك هاتوون، خەڵكی ناوچەكە بڕوایان نەدەكرد كە ئەو فڕۆكانە بۆ بۆردومانی ناوچەكە هاتبن، فڕۆكەكان لەگەڵ بەرەبەیانی ئەو ڕۆژەدا دەستیان كرد بە بۆردومانی گوندی عەبابەیلێ، شەڕ لە ناوچەكەدا گەرم بوو، دوای بۆردومانێكی خەستی ناوچەكە فڕۆكەكان گەڕانەوە بەرەوخوار بۆ بەغداد. لە ئەنجامی ئەو بۆردومانەدا نزیكەی (10 تا 12) هاوڵاتی بێتاوان لەدانیشتوانی عەبابەیلێ كوژران. لەپاش ماوەیەك ئۆردوویەكی[1] ئینگلیز لەڕێگەی (مەیدان)ەوە هاتنو گەیشتنە گوندی (چاوگی باوەكۆچەك)، لەوێ بنكەیەكی سەربازی گەورەیان دانا، كاتێك كە شێخانی عەبابەیلێ ئەم هەواڵەیان پێگەیشت ترسیان لێنیشت، بۆیە بوون بەدووبەشەوە لەنێوخۆیاندا، هەندێكیان بوون بەلایەنگری ئەحمەد موختار، هەندێكی تریان بڕیاریاندا هەر لەگەڵ حامید بەگدا بمێننەوەو پشتگیری لێبكەن. هەمان ڕۆژ دوو هێزی ئینگلیز ڕوویانكردە گوندی عەبابەیلێو سووتاندیان[2] .

هێزەكانی ئینگلیز هاتنە ناوشاری هەڵەبجەوەو بانگەوازێكیان بڵاوكردەوە، داوایان لەخەڵكانی یاخی بوو لە ئینگلیز كرد كە خۆیان تەسلیم بكەن[3] . نەیارەكانی ئینگلیزو ئەو كەسانەی لە شۆڕشەكەی شێخ مەحموددا بەشداریان كردبوو، دوای بیستنی ئەو بانگەوازەی ئینگلیزەكان ئەوەیان ڕەتكردەوە كەخۆیان تەسلیم بكەن، هەموو پێداویستییەكی شەڕو خواردنیان لەگەڵ خۆیاندا بردە گوندی هاوار، خۆشیان ئامادە كرد بۆ ڕوویەڕووبوونەوەی هەر هێرشێكی ئینگلیزەكان، جاسوسو خەڵكانی لایەنگری ئینگلیز لە ناوچەكەدا ئەم هەواڵەیان گەیاندە هیزەكانی ئینگلیز[4] ، ئەمانە زیاتر پشتیان بە هاوارییەكان بەستبوو، چونكە لەلایەكەوە شارەزای ناوچەكە بوون، لەلایەكی ترەوە تفەنگچی باشیان هەبوو، لەگەڵ خەڵكانێكی تر لە گوندەكانی عەنەبو دەڵەمەڕو سازان...هتد[5] .

چەكدارەكان گرنگترینیان: (شێخ ڕشیدی عەبابەیلێ، شێخ كەریمی برای شێخ ڕەشید، باقی حاجی مورادخان، فەتاحی حەمە چاوەش، حەمەساڵحی شاوەیس، ئەحمەدی مەحمود ئاسك، عەلی حەمە عەزیز، مام تۆفیق هاواری، هەیاس هاواری، ئەلی ئێران پەنا، سەی مورادی هاواری، سەی قادری كەچ، شێخ ئەولای سەید ئەحمەد، فەتەی وەستا حەمەكەریم، حەمەسەعید زەردۆیی، ئەلەی بەیخان زەردۆیی، شێخ عوسمان عەبابەیلێ، ئەورەحمانی مینە، ئەفراسیاب بەگی ڕۆستەم سان، مستەفا بەگی جافرسان... هتد) بوون.

سوپای ئینگلیز لە (چەمی بیەكە)وە سەركەوت بەرەو شاخی شنروێ، چەكدارە ڕاپەڕیوەكان لەدەربەندی (ئەشكەوەڵ)[6] دا سەنگەریان گرتبوو، بڕیاریاندابوو هەتاوەكو سوپای ئینگلیز گوندی(هاوار) نەسوتێنن ئەمان خۆیان لەڕوویەڕوونەوەیان بەدووربگرن. سوپای ئینگلیز بێ هیچ ڕوویەڕووبوونەوەیەك گەیشتنە گوندی هاوار، پێشترو بەر لەگەیشتنی هێزەكانی ئینگلیز بەناوچەكەیان، دانیشتوانی گوندەكە، گوندەكەیان لەترسی ئەو هێزەی ئینگلیز چۆڵ كردبوو. هێزەكەی ئینگلیز بە گەیشتنیان بۆناو گوندەكە ئاگریان تێبەرداو هەرشتێكیش كە بەكەڵك هات بە وڵاخ باریان كردو

---

[1] ـ ئۆردوو, وشەیەكی توركی مەغۆلی یەو بەمانای لەشكر دێت. (عومەر مەعروف بەرزنجی: نوریەخشی (شیعرەكانی مەلیكی كوردستان شێخ مەحمود بەرزنجی) , چاپخانەی شڤان, سلێمانی, 2006, ل49)

[2] ـ چاوپێكەوتنی حاجی عەبدولقادر: سەرچاوەی پێشوو.

[3] ـ ڕەمەزان هەمیرخان (كۆساری):سەرچاوەی پێشوو, ل109.

[4] ـ هەمان سەرچاوە, ل109ـ110.

[5] ـ هەمان سەرچاوە, ل110.

[6] ـ دەكەوێتە نێوان هەردوو گوندی عەبابەیلێ و هاوارەوە.

بەدەربەندی (ئەشکەوەڵ)دا گەڕانەوە[1]، لەم کاتەدا چەکدارەکان لەناو بەردەکانی دەربەندەکەدا خۆیان ئامادەکرد بۆلێدانی ئینگلیزەکان، دوای ئەوەی کە گوندی هاواریان سووتاند، لەبەرئەوەی کە هێزەکەی ئینگلیز شارەزای ناوچەکە نەبوون، پشتیشیان بەخەڵك نەبەستبوو لەو شەڕەی کەڕوویدا لە دەربەندەکەدا لەنیوان هەردوولادا، ئینگلیزەکان لەپاش شەڕێکی قورس بەخراپی تێکشکانو گەڕانەوە گوندی عەبابەیلێ، لەگەڕانەوەیاندا ئەو وەرزێرەیان کوشتبوو کەڕۆژی پێشووتر سەبارەت بەهەبوونی چەکدارەکان لەو ناوچەیە پرسیاریان لێکردبوو[2].

جاری دووەم ئینگلیزەکان عەشایەری ناوچەکەیان خستە پێش خۆیانەوە، چەکدارەکان تەقەیان لەئینگلیزەکان نەکرد بۆئەوەی خەڵکی بێتاوان کە ئینگلیزەکان لەگەڵ خۆیاندا بەزۆر هێنابوونیان نەکوژرێت، ئینگلیزەکان دووبارە گوندی هاواریان ئاگرتێبەردا لەگەڵ هەموو ئەو ئازوقەو خواردنەی کە چەکدارەکان بۆپێداویستی خۆیان بردبوویانە ئەوێ، لەبەرامبەردا چەکدارەکانیش هێرشیان کردەوە سەرهێزەکەی ئینگلیز، عەشایرەکان هەڵاتنو هێزەکەی ئینگلیزیش پەرتەوازە بوو، ژمارەیەکی زۆریان لێکوژرا[3]، (بەکر حەمەصدیق) ژمارەی کوژراوەکان بە (60 – 70) سەرباز لە قەڵەم دەدات، سەرەڕای بەجێهێشتنی بارو بارگەکەشیان[4].

دواتر لە ڕێگەی گفتوگۆوە لە نێوان سوپای ئینگلیزو چەکدارەکاندا ڕێگە بە ئینگلیزەکان درا کە کوژراوەکانیان ببەنەوە، سەربازێکیان لێ بەجێما کردیان بە ژێر بەردەوە، لەبەر ئەوەی بەکەڵکی ئەوە نەهاتووە دەستکاری بکرێت، ئێستاش ئەو شوێنە دەوترێت (خڕی ئینگلیزە کوژراوەکە).

دوای ئەم ڕووداوە ئینگلیزەکان جافرسانیان بانگکرد بۆ ئەوەی چارەسەری ئەو کێشەیان بۆ بکات، (کاپتین)ی ئینگلیزەکان ئەوەی بە جافرسان وتبوو کە هاوارییەکان شێخ ڕەشیدیان بۆ بگرێت، سەریان بۆ ئینگلیزو ماڵیان بۆ ئەو[5]. لەبەرئەوەی جافرسان ژنو ژنخوازی لەگەڵ جافەکانو هەروەها لەگەل شێخ ڕەشیددا هەبوو، جافرسان ڕێگەی خۆشکرد بۆ حامید بەگو شێخ ڕەشیدو هەرکەسێکیش کە لەگەڵیاندا بڕوات بۆ دزڵێ[6]. چەکدارەکان ڕوویانکردە ناچەی (باراماوا)ی مەحمود خانی دزڵی لە ئێران. هاوارییەکانیش لەم نێوەندەدا مانەوەو خۆیان تەسلیمی ئینگلیزەکان نەکرد[7].

چەکدارەکان ماوەیەکی کەم لە باراماوا مانەوەو جێیان پێ لێژبوو، چونکە دەسەڵاتی ئینگلیز هەموو ناوچەکەی گرتبووەوە، ئەوەی سەرپێچی ئەولنی بکردایە یان لەناو ئەبرا یان ئەبوایە بە شاخەوە بمایەتەوە[8]، لەلایەکی ترەوە هۆزو عەشیرەتە کوردەکان ناکۆکیان لە نێواندا هەبوو[9]، لەبەرئەوە نەبوونی زەمینەیەکی شیاو بۆ مانەوەی ئەو چەکدارانە، وای لێکردن بیر لە خۆبەدەستەوەدان بکەنەوە، بۆیە پاش ساڵێك چەند گفتوگۆیەك ئەنجام دراو سەرانی چەکدارەکان خۆیان

---

[1] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: لاپەڕەیەك لە, ل68.
[2] ـ ڕەمەزان هەمیرخان (کۆساری): سەرچاوەی پێشوو, ل110.
[3] ـ هەمان سەرچاوە, ل110.
[4] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: لاپەڕەیەك لە, ل68.
[5] ـ ڕەمەزان هەمیرخان (کۆساری): سەرچاوەی پێشوو, ل110.
[6] ـ هەمان سەرچاوە, ل111.
[7] ـ هەمان سەرچاوە, ل111.
[8] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: لاپەڕەیەك لە, ل69.
[9] ـ هەمان سەرچاوە, ل69.

بەدەستەوەداو بەڵێنی دانیشتنو ئاشوب نەنانەوەیان بەئینگلیزدا [1]. ئینگلیزەکان لەدوای ئەو ڕووداوە سەرانەیان لەحاجی بەگو داود بەگی ئامۆزای دەسەند، بەهۆی بەشداربوونیانو یارمەتی دانی شۆڕشەکەی شێخ مەحمود [2].

ڕەسوڵ هاوار باس لەوە دەکات دوای ئەوەی حامید بەگی جاف لەترسی ئینگلیزەکان پەنای بردە بەرهەورامانی تەخت (بەشی ئێران)، ئینگلیزەکان بۆ ئەوەی حامید بەگ بگرن مستەفا بەگی جافرسانی هەورامیان گرتو داوایان لە ئێرانیەکان کرد کە ئەگەر حامید بەگ بگرنو بیدەنە دەست ئینگلیزەکان، ئەوانیش مستەفا بەگ تەسلیمی ئێران دەکەنەوە (لەو ڕۆژانەدا ئێرانیەکان دەیان ویست مستەفا بەگ بگرن) بەوجۆرە حامید بەگ گیراو نێرردا بۆ بەغداد، بەڵام پاش ماوەیەك توانی لە بەندینخانە ڕابکاتو خۆی دەرباز بکات، لەدواییدا ئیننگلیزەکان لێی خۆش بوون [3].

هاواریەکانیش بەناوی لێبوردنەوە بانگ کرانەوە بۆ هەڵەبجە، جافرسان کەسێکی نارد بۆ لای هاواریەکان پێی گوتبوون کە کاپتنێك کوژراوە، دەڵێن (سەید مورادو مام تۆفیق) کوشتویانە، بەڵام نزیکەی (26) پیاوی هاواری کەچوونە هەڵەبجە لەوێ گرتنیانو تفەنگەکانیان لێسەندنو لە گوندی (بامۆك) بەندیان کردن، دواتر گوێزانیانەوە بۆ کەرکوکو (27) مانگ حوکمدران، هەرچی ( سەید مورادو مام تۆفیق)ە، ڕۆشتن بۆناو کاکەییەکانی ئێران بۆ گوندی (باوەکۆسە)ی ئێران، تاوەکو بارودۆخی عێراق هێمن بوویەوە، پاشان گەڕانەوە بۆ هاوار [4].

پێشتر باسمان لەوەکرد کە چۆن مەحمود خانی دزڵی هاوکاری شۆڕشی یەکەمی شێخ مەحمودی کرد، ساتێکیش کە خێزانی شێخانو ئەوانەی بەشدارییان کربوو لەو شۆڕشەی شێخدا ئاوارەبوونو ڕوویان کردە ناوچەی مەریوان، ئەو خێزانانە لەناو ئاواییەکانی مەحمود خانی دزڵی دا حەسانەوەو یارمەتیان داون. بێجگە لەمەحمود خانی دزڵی لەوانەی کە یارمەتی خێزانە ئاوارەکانیان داوە مەحمود خانی کانی سانان بووە کە لە ناوچەی مەریواندا خزمەتی ئەو خێزانانەی کردووەو دالدەی داون، ئەگەرچی ئەو وەکو مەحمود خانی دزڵی هاوکاریو بەشداری شۆڕشی نەکردبوو. کەساتێك دوای شکاندنی شێخ مەحمود ئینگلیزەکان کەوتنە تۆڵە سەندنەوە لەو کەسانەی کە هاوکاری شێخیان کربوو یا یارمەتیان دابوو، هەردوو مەحمود خان لەوانە بوون کە ئینگلیزەکان داوایان لە حکومەتی ئێران کردبوو کە هەردووکیان بگرێتو تەسلیمی ئەوانی بکات، ئێرانیش هەردوکیانی گرتو دانیە دەست ئینگلیزەکان، مەحمود خانی دزڵی لە بەندینخانەی (هیندیە) تێکەڵ بەبەندییە دزو پیاوخراپەکان کراوەو خراوەتە ژێر ئەشکەنجەو ئازارەوە وەکو کرێکارێك خشتی کاڵیان پێ بڕیوە. بەڵام لەبەر ئەوەی مەحمود خانی کانی سانان بەشداری شەڕی نەکربوو تەنها بەوە وازیان لێ هێنا کەماوەیەك لەبەغدا دەست بەسەربێت بۆئەوەی لەناوچەکەی دووربکەوێتەوە، لەدواییدا هەردوکیان [5] بەردرانو گەڕانەوە شوێنی خۆیان [6].

لەئەیلولی ساڵی1920 چەند کەسێك بەشەو تەقەیان لەماڵی (عادیلەخانم) کرد، بەڵام هەرزوو زانرا کەئەوانە خەڵکی دزڵی بوون، بۆیە ڕۆژی دواتر دوو فڕۆکە لە بەغدادەوە هاتە سەرناوچەی هەورامانو هەردوو گوندی (باراماواو بەڵخە)یان

---

[1] ـ هەمان سەرچاوە, ل69.

[2] ـ شێخ لەتیفی حەفید: یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید لەسەرشۆڕشەکانی شێخ مەحمود,ئامادەکردنی کەمال نوری مەعروف, چ1, دهۆك, 1995, ل61.

[3] ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب1 , ل540 .

[4] ـ ڕەمەزان هەمیرخان (کۆساری): سەرچاوەی پێشوو, ل111ـ112.

[5] ـ محەمەد ئەمین هەورامانی دەڵێ: عادیلەخانمو ئەحمەد موختاری کوڕی پارەیەکی زۆریان داوە بەئینگلیزەکان بۆئەوەی مەحمود خانی دزڵی ڕزگاریکەن لە بەندینخانە.( مێژووی هەورامان, ب1, تەهران, 1380)

[6] ـڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب1, ل217ـ218 .

بۆمباران کرد، دواتر جافرسان‌و شێخ عەلادینی بیارەو محەمەد بەگ هاتن بۆ هەڵەبجەو بەناوی نزلیەوە داوای لێبوردنیان لەحاکمی هەڵەبجەو عادیلەخانم کرد[1].

مەحمود خانی دزلّی دوای بەربوونی، لە ئەیلولی ساڵی 1921 ڕێگەی پێدرا بگەڕێتەوە سلێمانی بەومەرجەی وەك بەڵێنی دابوو نەچێتەوە نێو خاکی ئێران (مەبەست ناوچەی دزلّییە کە کەوتبووە ناوسنوری ئێرانەوە ـ نوسەر)، بەڵام مەحمود خان بەڵێنەکەی شکاندو گەڕایەوە دزلّی‌و لەوێوە نامەی بۆ مستەفا کەمال ناردو داوای چەکی لێکرد بۆ دەرکردنی ئینگلیزەکان لەسلێمانی[2].

(ئیدمۆندز)یش دەڵێت: "لەساڵی 1922 کە بە ئیجازە گەڕامەوە، کرام بەجێگری حاکمی سیاسی لە هەڵەبجە کە ئەوە پلەیەکی زۆر بچوك بوو بە بەراورد بە(5) ساڵی ڕابردووم، بەڵام ئاگادارکرام کە هەڵوێست لە ناوچەی سلێمانی دا تەواو ئاڵۆز بووەو هەڵەبجەش پێویستی بەکەسێکی شارەزا هەیە، کەچووەمە هەڵەبجە عەشایری هەورامان دژی ئێمە هەڵسابوون بە سەرۆکایەتی مەحمود خانی دزلّی‌و مەحمود خانی کانی سان خۆی لەلایەن ئێرانەوە تەسلیم بە ئێمە کرابوو، بەڵام شتێکی زۆر بێ عەقڵانە بوو لە ئێمەوە کە ڕێگای مەحمود خانماندا لە پاش چەند مانگێك بگەڕێتەوە بۆ شۆڕشی خۆی کە لە وێوە دەستی کرد بە پەیوەندی کردن بە تورکەکانەوە"[3].

لە کانوونی یەکەمی 1921 ژمارەیەك سواری ناوچەی هەورامان، کە بێگومان پەیوەندیان بە مەحمود خانەوە هەبوو، هاتنە دەشتی هەڵەبجە (مەبەستی شارەزوورە ـ نوسەر)و کەوتنە کۆکردنەوەی باج، ناوەندی کانوونی دووەمی ساڵی1922 هێزێکی لیڤی کەوتنە ناو بۆسەیەکەوەو ژمارەیەکیان پێکران، کە یەکێکیان ئەفسەری بەریتانی (کاپتن ڤیتزگیبون)ی فەرماندەی هێزەکە بوو. دوای ئەوە ئینگلیزەکان لە جیاتی پیادە بەفڕۆکە هێرشیان کردە سەر هەڵەبجە. هەروەك ئینگلیزەکان خۆیان باسیان لێوەکردووە ئەنجامی ئەو شەڕە زۆر سەرکەوتووبوو، مەحمود خانی دزلّی ناچاربوو گەڕایەوە بۆ گوندی دزلّی، بەڵام پیاوەکانی لە پەلاماردانی دەشتی هەڵەبجە نەکەوتن. مانگی مارت فشاری فڕۆکە مەحمود خانی ناچارکرد پەیوەندی بەئینگلیزەکانەوە بکات[4].

نزیکەی دوو هەفتە بەر لەگەڕانەوەی شێخ مەحمود لە ئاوارەییەکەی بۆشاری سلێمانی بەگزادەکانی جاف کەپێکهاتبوون لە (حسێن بەگی حەسەن بەگ، ئەحمەد موختار بەگ، حامید بەگ، محەمەدی فەتاح بەگ، جەمال بەگی جەمیل بەگ، ئەحمەد بەگی محەمەد بەگ) لەسەر داوای شێخ قادری برای شێخ مەحمود، سەردانی شاری سلێمانیان کردو ڕۆژی 1922/9/19 گەڕانەوە بۆشاری هەڵەبجە[5]. لە کۆتایی ئەیلولی 1922 کەشێخ مەحمود لە دورخراوەییەکەی گەڕایەوە، لە یەکەم قۆناغی هاتنی بۆ کوردستان‌و لەشاری کفری کۆمەڵێك لە بەگزادەکانی جاف چوون بەپیریەوەو لەو شارەدا بەدیدەنی گەیشتن[6]. بانگی کوردستان دەنوسێت: "لە بەگزادانی جاف جەنابان کەریم بەگ فتاح بەگ، حامید بەگ،

---

[1] ـ ڕۆژنامەی پێشکەوتن , ژ(22), 1920/9/23.

[2] ـ عومەرمە عروف بەرزنجی: مەحمود خانی دزلّی شۆڕشگێڕی ڕۆژهەڵاتی کوردستان, چ2, 2000, ل95ـ96.

[3] ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل220.

[4] ـ د. کەمال مەزهەر: چەندلاپەڕەیەك لە, ب1, ل118، عومەرمەعروف بەرزنجی: سەرچاوەی پێشوو, ل96.

[5] ـ سدیق ساڵح: حکومەتی کوردستان (1918 ـ 1924) سلێمانی، 2003، ل 57.

[6] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل237. ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل292.

ئەحمەد موختار بەگ تەشریفیان هاتە (صلاحیە ـ کفری)، بە شرفی زیارەتی حەزرەتی حکمدار مشرف بوونو بۆ ئەمە کە لە (کەلار)ەوە بێن بۆ سلێمانی رخصتیان طلب کردو عودتیان فرمو" [1].

پێشترو بەر لە گەڕانەوەی شێخ بە هەفتەیەك بۆ شاری سلێمانی لەسەر پێشنیاری مستەفا پاشای یامولکی (جەمعیەتی کوردستان) [2] دروستکراو ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان)ی بڵاوکردەوە، لە دروستکردنی ئەم کۆمەڵەیەدا عیزەت بەگی عوسمان پاشای جاف بە (39) دەنگو شێخ محەمەد گوڵانی بە (37) دەنگ دەبنە ئەندامی دەستەی بەڕێوەبردنی [3].

تەنانەت بۆ کڕینی چاپخانەیەك بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەکە، هەروەك ڕۆژنامەی (بانگی کوردستان) ئاماژەی بۆکردووە هەریەکە لە( عەبدولکەریم بەگ) کە یەکێك بووە لەسەردارەکانی جافو (ئەحمەد موختار)ی قایمقامی هەڵەبجە بڕی(450) ڕوپیە و(عیزەت بەگ)ی برای ئەحمەد موختار(100) ڕوپیەیان بەخشیوەتە کۆمەڵەکە [4].

لە 1922/10/9 جارێکی تر جافەکانی هەڵەبجە کە بریتی بوون لە (عەلی بەگی مەحمود پاشا، کەریم بەگی فەتاح بەگ، حسێن بەگی مەحمود پاشا، حامید بەگی مەجید بەگ، ئەحمەد موختار، ئەحمەد بەگی مەحمود پاشا، حسێن بەگی حەسەن بەگ، ئەحمەد بەگی حەمە ساڵح بەگ، داود بەگی حەمەسەعید بەگو محەمەد بەگی فەتاح بەگ... هتد) سەریان لە شێخ مەحمود داوە لە سلێمانی [5].

کاتێك شێخ مەحمود حکومەتی دووەمی ڕاگەیاند، عادیلەخانی ژنی وەسمان پاشا بە خۆیو دەستو پێوەندەکانییەوە هات بۆ سلێمانی بۆ پیرۆزبایی کردن لە شێخ مەحمود، بەڵام ئەو هاتنەو ئەو پیرۆزباییەی بەدڵ نەبوو، ڕووکەشو سەرزاری بوو [6].

لە (13 کانونی یەکەمی 1922) بە ئامادەبوونی شێخ حەمە غەریب وەزیری ناوخۆی حکومەتەکەی شێخو بەگزادەکانی جافو هەورامانو خەڵکانی ناوەوەو دەرەوەی شاری هەڵەبجە، ئاڵای حکومەتی دووەمی شێخ لە شاری هەڵەبجە هەڵکرا [7].

ئەحمەد موختار لەو سەردەمەدا قایمقامی هەڵەبجە بووە، پەیوەندی لەگەڵ شێخدا باش نەبووە، بۆیە هەر لەو کاتەدا لە (شوباتی 1923) کە سەر لە سلێمانی دەدات، شێخ مەحمود دەیگرێتو ڕەوانەی بەندیخانەی دەکات لە ئەشکەوتی (جاسەنە) لە سورداش، ناوبراو ماوەیەك لە بەندیخانە بەسەر دەبات، هۆی ئەو گرتنو بەندکردنەشی بەزۆری ئەو هەڵوێستە جیاوازەی بوو کە لەبارەیەوە ئەیانگێڕایەوە کە جارێ لایەنی شێخی دەگرتو جارێ لایەنی ئینگلیز، ماوەی گرتنەکەشی

---

[1] ـ ڕ. بانگی کوردستان, ژ (9), 1922/10/8. سدیق ساڵح: سەرچاوەی پێشوو, ل57.

[2] ـ جەمعیەتی کوردستان ڕۆژی هەینی (21ی تەموزی 1922) لە کۆبونەوەیەکی گەورەدا لەمزگەوتی سەید حەسەنی موفتی لەشاری سلێمانی بەسەرۆکایەتی موستەفا پاشای یامولکی دامەزرێنراو لەڕێگەی دەنگدانی نهێنییەوە مامۆستایان: (ڕەفیق حیلمی، ئەحمەدبەگی تۆفیق بەگ، صاڵح قەفتان، فایق بەگی مارف بەگ، حاجی ئاغای فەتحوڵڵا، عیزەت بەگی عوسمان پاشا، ئەدهەم ئەفەندی، ئەحمەد بەهجەت، شێخ محەمەد گوڵانی، شێخ عەلی سەرکار، عەلی باپیرئاغا، عەبدوڵا ئەفەندی محەمەد ئەفەندی، شوکری عەلەکە) بۆ بەڕیوەبردنی کۆمەڵەو ئۆرگانی کۆمەڵە هەڵبژێرران. (د. کەمال مەزهەر :چەند لاپەڕەیەك لە, ب1 ,ل47)

[3] ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل232.

[4] ـ ژ(6) , 18/ ایلول/ 1922 .

[5] ـ جەمال بابانوئەوانی تر: سلێمانی شارە گەشاوەکەم, ب3,چ3, ل321. سدیق ساڵح: سەرچاوەی پێشوو, ل61.

[6] ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب1, ل205.

[7] ـ سدیق ساڵح: سەرچاوەی پێشوو, ل24.حەکیم مەلا ساڵح: سەرچاوەی پێشوو, ل261ـ262.

لەوەدەچێت کەم بوونبێت[1]، حامید بەگ، باس لەوە دەکات کە ئەحمەد موختار پێش ئەو گرتنەی جارێکی تر سەردانی سلێمانی کردووەو لایەنگری خۆی بۆ شێخ دەربڕیوە، دواتریش گەڕاوەتەوە هەڵەبجە، بەڵام دوای ماوەیەك دەنگوباسو زانیاری وا دەگەیەننە شێخ کە (ئەحمەد بەگ) پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا هەیەو هاریکاریان لەگەڵدا دەکات، بۆیە ئەم جارەیان هەر کە ئەحمەد بەگ دەگاتە سلێمانی ڕاستەوخۆ دەیگرێو حەپسی دەکات[2]، بۆچوونێکی تر دەڵێت کە ئەحمەد موختار کۆمەڵێك هەڵوێستی هەبووە بەرامبەر بە خەڵکێك کە لە دەوروپشتی شێخدا بوونو شێخیان زۆر بەهەڵەدا بردووەو نەیان ویستووە خوێندەوارو ڕۆشنبیر لە شێخ نزیك بێتەوە، هەر ئەوانەش بە گوێرەی دووزمانیو نەخوێندەوارییانو خۆبردنەپێشەوە شێخیان تووشی ئەو هەڵەیە کردووە[3].

کاتێك ئەحمەد موختار لە ئەشکەوتی (جاسەنە) دەستبەسەر دەبێ ئەم شیعرەی بۆ شێخ مەحمود نووسیووە[4]:

سەبـا عەرزی خلوصـیو بەندەگیمو هەم دوعا خوانی
ببە بۆ شاهی موحیطـی گشت سلێمانـی
بڵێ قوربانی تۆبم ئەی صلاح الدینی ئەیوبی
بەزور پەنجە وەك حەیدەر بەسیما یوسفی سانی
ئەبێ ئەم قەومە ئەمڕۆ شادو خەندانو شاگۆبن
کە چونکە تۆ شەهنشاهو رەئیسی جمعی کوردانی
لەدەست کافرنەجاتمان بوو، بحمدالله وەل مینە
لەسایەی دەستو تیغی هیمەتی تۆشێری یەزدانی
خوداوەند بەلوتفی خۆت لەچاوی بەد دوریکە
بەجاهی سەیدالمرسل بەرۆحی شاهی گەیلانی
لە پاش ئەم ئیحترامانە بڵێ بەوشاهی دەورانە
چی جورمێکی هەیە ئەحمەد کە کردوتە بەزیندانی
ئەگەر شایەد لەخزمەتتا خراپەی ئەویوە ثابت
بەلوتفی خۆت عەفوی کەچونکە هەرخۆت صاحب احسانی
کەجورمێکی نیە تاکەی لەحەپسا دانیشێ قوربان
لەتەنهایی لەفکری چۆتەوە ئادابی ئینسانی
ئەگەر داوای کەفیلی لێ ئەفەرموون حازرە یاخود
مەلیك تەئمین ئەکا سەدجار بەئاینو بەئیمانی
هەتامردن وەکو بەندە لەخزمەت شاهی کوردستان

---

[1] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل240.
[2] ـ هەمان سەرچاوە, پ45, ل240.
[3] ـ ئەحمەد عینایەت: ئایا بەندکردنی ئەحمەد موختار جاف لەئەشکەوتنی (جاسەنە) لە جێگای خۆیدا بوو؟ , گۆڤاری (ڕەنگین), ژ(120), 1999 , ل20.
[4] ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل506.

حیاتی خۆی فیداکات بۆهەموو ئەمرێکوفەرمانی

من ئەم حەپسەم لەلا فەخرە بەشەرتێ سروری کوردان

لەحەق ئەم بەندەیەی خۆیە بمێنێ لوتفی جارانی

بەذاتی پاکی بێ هەمتا بەنوری احمدی مرسل

جەنابت سوێند ئەدەم بەگشت ئایاتی قورئانی

بەلوتفـو مەرحەمەت ئەم بەندەی خۆتە عفوفرمو

ئەتۆ صرف نظرفەرمو لەجورمو سەهوو نەسیانی

لەلوتفی تۆ زیاتر هیچ پەناهێکی نیە زیاتر

بەکاری هیچ نەهاتن، دۆستەکانوخزمو خوێشانی

ئەوسا قائمقام ئێستا محبوس: احمد موختار[1]

بە گەیشتنی ئەو شیعرە بۆ لای شێخ مەحمود، بڕیاری ئازادکردنی ئەحمەد موختاری داوە لە بەندیخانە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت مانەوەی لە بەندیخانەدا ماوەیەکی زۆر کەمی خایاندووە[2]. پاش ئەو ماوە کەمەی بەندیخانەی شێخ، ئەحمەد موختار دەسەڵاتی پەیداکردووەتەوە، هەموو ئەو ڕۆژنامەو چاپەمەنیانەی لەبەردەستدا بوو کە ئینگلیزخواهە کوردەکان گرتبوویان بەدەستەوەو هێرشیان تیادا دەبردە سەر شێخ مەحمود، بەلاَم ئەحمەد موختار، هەروەك دکتۆر عیزەدین باسی لێوە دەکات، وەك هاوڵاتییەکی بەشەرەف، دوای ئەو بەربوونەی چ بەنووسینو قسەوتن، چ لە ڕەفتاری ڕۆژانەیدا، لە گوڵ کالّتری بە شێخ مەحمود نەوتووە، لە ڕۆژانی نوشوستیو بێ دەسەڵاتی شێخدا هەر دڵسۆزی بوو، شێخ مەحمودیش تا دوا ڕۆژەکانی ژیانی لە جێگای خۆیداو لە کاتی باسکردندا بە سۆزو خۆشەویستیو بەرزییەوە ناوی ئەحمەد موختاری هێناوە[3].
ئەحمەد موختار لەلایەن ئینگلیزەکانەوە لە ساڵی 1923 کراوەتەوە بەقایمقامی هەڵەبجە[4].

(حامید بەگ)یش، کە لەسەرەتای دەسەڵاتدارێتی شێخ مەحموددا کە حوکمدار بووە لەگەڵ شێخ دلبوو، بەلاَم لەدواییدا لێی جیابوویەوەو ئینگلیزەکان کردیان بەجێگری قایمقامی هەڵەبجە کە ئەحمەد موختار جاف بوو[5].

کاتێك ئینگلیزەکان بۆیان دەرکەوت شێخ مەحمود ئەو مەبەستانە ناهێنێتەدی کە شێخیان بۆ هێنابووەوە، سەرلەنوێ دەستیان کردەوە بەکەم کردنەوەی سنوری دەسەڵاتیو (هەڵەبجەو ڕانیەو کۆیە)یان لێ دابڕی، بەهەموو شێوەیەك هەوڵیان دەدا کەدەسەڵاتی دارایيو ئابووری شێخ کەم بکەنەوە[6]. خراپی پەیوەندی نێوان شێخو ئینگلیزەکان گەیشتە ڕادەیەك ڕۆژی (1ی مارتی 1923) فڕۆکەکانی ئینگلیز شێخ مەحمودیان ئاگادارکردەوە کەبەبێ دواکەوتن خۆیو هێزەکانی لەسلێمانی بڕۆنە دەرەوە، بەلاَم کاتێك شێخ مەحمود ملی نەدا، ڕۆژی 3ی مارتی 1923 فڕۆکەکانی ئینگلیز کەوتنە بۆردومانکردنی شاری سلێمانی، لەئەنجامدا ژمارەیەك خەڵکی بێتاوان کوژرانو بریندار بوون، ئەوسا شێخ مەحمود ناچاربوو

[1] - ڕ(ڕۆژی کوردستان)، ژ(13)، 1341 ك.

[2] - عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل241.

[3] - د.عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ: سەرچاوەی پێشوو، ل22.

[4] - عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل241.

[5] - ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو، ب1، ل205.

[6] - ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو، ب2، ل318 .

بەرەبەیانی (4ی مارت) بەخۆیو هێزەکانیەوە بکشێتەوە ناوچەی سورداشو ئەشکەوتی (جاسەنە)ی کردە بنکەی سەرکردایەتی خۆی[1].

دوورکەوتنەوەی شێخو هاوەڵەکانی زۆری نەخایاند، ئەوەبوو لە تەمموزی هەمان ساڵدا(1923) گەڕانەوە شاری سلێمانی، شێخ مەحمود دوای گەڕانەوەی بۆ سلێمانی سێیەمین حکومەتی خۆی دامەزراند، دوای ئەوەی هێزەکانی ئینگلیز لە (17/حوزەیرانی/1923) شاریان بەجێهێشت[2]. هەروەك ئەحمەد خواجە ئاماژەی بۆ دەکات، لەم کاتەدا بەگزادەکانی جاف یەکەم کەس بوون کە هاتن بۆ سلێمانی، بە سەرۆکایەتی کەریم بەگی فەتاح بەگی جافو هەموو بەگزادە ناودارەکان بە (40) سواری تیرەکانی جافەوە هاتن بۆ سلێمانیو میوانی تایبەتی مەلیك مەحمود بوون، شەوەکەی دوای گفتوگۆیەکی زۆر لە نێوان کەریم بەگی فەتاح بەگو بەگزادەکانی جاف لەلایەکو شێخ مەحمود لەلایەکی تر، لەسەر چەند خاڵێك ڕێکەوتن، بەگزادەکان بڕیاریاندا بەم شێوەیە لەگەڵ شێخ مەحموددا بنو هاوکاری بکەن:

یەکەم: بۆ ماوەی ساڵێك بەبێ داوای هیچ یارمەتییەك.

دووەم: لە ساڵی دووەمدا بە چەك یارمەتی بدرێن.

سێیەم: لە ساڵی سێیەمدا بە سوپا بزانرێن.

شێخ مەحمودیش لەوەڵامی کەریم بەگدا دەڵێت: "زۆر سوپاستان دەکەم نامەوێ بەسوێند یا بەزۆر ئێوە بگرم، منو ئێوە دەبێ هەروەکو یەك گیانو دارایی بەخت بکەین بۆ ئازادی. ئازادیش بەخۆڕاییو بەبێ ئەرك دەسناکەوێ، بەڵکو دەبێ بسەنرێت، مادام ئێوە دڵپاکن سوێند خواردن پێویست نییە ، زۆر سوپاستان دەکەمو منیش لەڕێگەی ئازادی کورددا بچووکتانم". کەریم بەگیش لەوەڵامی شێخدا دەڵێت: "پەیمان بێ تۆ دۆستو دوژمنی هەر عەشیرەتێك یا هەر حکومەتێك بی، ئێمە لەگەڵتاین"[3].

بەڵام گەلێك هۆو کۆمەڵێك کەموکوڕیو چەوتیو ناشارەزاییو هەڵەی هەندێ لە کاربەدەستانی فەرمانڕەواییەکەی شێخ کارەکەی پێچەوانە کردو وایکرد کە زۆر کەسو گەلێ لایەن کە لەوانە (جاف) بوون وردە وردە لەو حکومڕانییەی شێخ کشانەوەو لە ڕای پێشوویان پاشگەزبوونەوە دوای ئەوەی نائومێدبوونو ئەوەی لێی چاوەڕوان دەکرا نەهاتەدی، بگرە زۆرجار ئاشووبو گێرمەو کێشە باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشاو دووچاری خەڵکەکە بوو، ئەمانە هەموو تێکڕا زەمینەیان بۆ ئەو هەڵوێستە تازەیە خۆشکردو دوایی چوونە پاڵی ئینگلیز[4].

هەر ئەمەش وای لە ئەحمەد خواجە کردووە کە بڵێ: "ئەو پیاوە گەورەو خانەدانانە لە پاش ئەو بینینەی مەلیکو گەڕانەوەیان هەر بە نیازی بڕدانی هەڵەبجەو خستنەسەر کفری خۆیان لە بەڵێنەکەیان دوورخستەوە. هانی (خەلیفە یونس)یان دەدا کە پەلاماری ئەو هێزە بدات کە لە شارەزووردا بۆ ئاسایشی دەسووڕایەوە. ئەوەبوو ماجید مستەفا بە (50) سوارەوە لە نزیك گوندی (گرێزە)ی شارەزوور بەرەنگاری خەلیفە یونس بوویەوەو گرتیو هێنای بۆ سلێمانی، بەڵام مەلیك مەحمود لێی خۆشبوو. خەلیفە یونس لە ئەنجامی ئەو هەڵوێستەی شێخدا خۆیو خزمەکانی تێکەڵ بە سوپای شێخ بوو بەڵێنی خۆی بردەسەر. ئەوانەی لەو ڕۆژانەدا لە سەرەتادا تێکەڵ بە شۆڕش نەبوون لە هەڵەبجە تەنها بەگزادەکانی جافو تیرەی میکایلی بوون"[5]. بەڵام ئیتر وەنەبووبێ وەکو وتمان هەموو بەگزادەکانی تری جاف لەگەڵ شێخ مەحموددا

---

[1] ـ ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: سەرچاوەی پێشوو, ل166ـ167 .

[2] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەبریم: سەرچاوەی پێشوو, ل241ـ242 .

[3] ـ چیم دی, ب2, ل47، ڕەسول هاوار: سەرچاوەی پێشوو,ب2, ل532.

[4] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل233.

[5] ـ ئەحمەد خواجە: سەرچاوەی پێشوو, ل47ـ48. ڕەسول هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2,ل533.

نەبووبن. بۆ نموونە داودبەگی جاف، کە لە بەگزادەکانی کەلار بووە، لە شەڕی (ئاوباریك) دا هاوکاری شێخ مەحمود بووە، شانبەشانی ئەو شەڕی کردووە، زۆرجار شێخ وتوویەتی: داود شێرە شێر... جگە لە داود بەگی جاف (کەریم بەگی فەتاح بەگ)یش لە ساڵەکانی دواتردا بە زۆری لەگەڵ ئینگلیزو حکومەتدا ڕێك نەبووە [1].

لەو ماوەیەدا ئەحمەد موختار هەرقایمقامی هەڵەبجە بوو، کە دیارە هەریەپێی فەرمانەکەی (ئیدمۆندز) ئەو پلەیەی بەرکەوتووە [2]، ئەوەتا ئیدمۆندز دەڵێت: "بەڵام لەهەڵەبجە، بەرلەچۆڵکردنی شاری سلێمانی کاری جۆراوجۆرم بەسەر بەگزادە گرنگەکانی جافدا دابەش کرد. ئەحمەد بەگی کوڕی خانم بەقایمقامو، حامید بەگ بەجێگری قایمقامو کەریم بەگ بەکارگوزاری عەشیرەتی جاف [3]. هەروەها پەیمانێکیشم پێ ئیمزا کردن، کە دژی یەکتر نەجوڵێنەوەو بۆ تەریککردنی ئەوکەسانەی کە لەلایەن شێخ مەحمودەوە دادەنرێن، هاوکاری یەکتربکەن. مووچەی پازدە ڕۆژو هەندێ پارەی زیادەم بۆ بەڕێوەبردنی کاری ناوەندێکی بچووك دابوونێ و پێم گوتبوون بەر لەتەواوبوونی مانگ بۆ گفتوگۆکردن دەربارەی دامەراندنی موچەخۆرو پۆلیسەکانیان بێنە کەرکوك" [4].بەوپێیە قەزای هەڵەبجە بەدرێژایی ئەوماوە (دەورە) دەسەلاتێکی بەردەوامی نەشێخو نەئینگلیزی بەسەرەوە نەبوو. سەنگاویش حاڵەتێکی لەو شێوەی هەبوو [5].

ئینگلیزەکان دوای جێهێشتنی شاری سلێمانی بۆ لاوازکردنی دەسەڵاتی شێخ مەحمود هەموو هەنگاوێکی پێویستیان نا، بۆ دابڕینی ناوچەکانی (ڕانیە، هەڵەبجە، قەڵادزێ، سەنگاو، چەمچەماڵ، قەرەداغ، ماوەت)و بەتوندی ئاگاداریانکردەوە کە نابێ دەست بخاتە ناوکاروباری ئەم ناوچانە. کە ئەم هەڕەشەیە خۆی لەخۆیدا، دەکرا لە هەموو ئانوساتێکدا بکرێتە بیانوو بۆ لێدانی شێخ مەحمود [6].

هەر بۆیە کاتێك زانییان شێخ مەحمود دووبارە خەریکی تەقەلادانو پەل هاویشتنە، کەوتنە خۆ بۆ لێدانی حکومەتەکەیو لەناوبردنی دەسەڵاتەکەی، ئەوەبوو لەڕێکەوتی (16ی ئابی 1923) بۆردومانی شاری سلێمانیان کرد بە بۆمبای (220) پاوەندی کە یەکەمجاربوو لەمێژوودا ئەم بۆمبایە بەکاربێت، تەنانەت (جۆن سالمۆند)ی فەرماندەی هێزی ئاسمانی لە عێراق خۆی سواری فرۆکەبووە بەمەبەستی بۆردومانی سلێمانی، بەتایبەت بۆلێدانی ماڵی شێخ مەحمود هاتووە [7]. فرۆکەکانی ئینگلیز ماڵی خودی شێخیان کردە ئامانج، بەڵام لەوکاتەدا شێخ مەحمود لەماڵی عیزەت بەگی کوڕی وەسمان پاشادا بوو [8]، هەر ئەو ڕۆژەیش شێخ حەمە غەریبی وەزیری ناوخۆی حکومەتی سێهەمی شێخ مەحمود

---

[1] ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب1, ل205-206 .

[2] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل242.

[3] ـ هەروەك حامید بەگ خۆی گێراویەتیەوە بۆ د. ئیحسان فوئاد, ماوەیەك قەزای هەڵەبجە کراوە بەدوو بەشەوەو دووجۆر بەڕێوەبەرایەتی هەبووە , حامید بەگ کراوەبە (جێگری حاکمی سیاسی)و لێپرسراوی ناحیەکانی (پێنجوێنو خورماڵ) –بەشی یەکەم – وئەحمەد موختاریش جگە لەوەی (جیگری حاکمی سیاسی) بووە, لێپرسراوی (هەلەبجە خۆی و ناحیەی وارماوا) بووە –بەشی دووەمی قەزاکە ـ ( بەوەرگرتن لە ئەحمەد موختاربەگی جاف: مەسەلەی ویژدان, پێشەکیو لێکۆلێنەوە د.ئیحسان فوئاد, سلێمانی ,2006, پ50 ,ل83.

[4] ـ کورد تورك عەرەب ,ل412.

[5] ـ سدیق سالح: سەرچاوەی پێشوو, ل27.

[6] ـ ئاکۆعەبدولکەریم شوانی: سەرچاوەی پێشوو, ل173-174.

[7] ـ هەمان سەرچاوە, ل175.

[8] ـ ئەکرەمی مەحمودی سالحی ڕەشە: شاری سلێمانی , ب2,بەغدا, 1987, ل351 .

بەهێزێکەوە ڕۆیشتە ناوشاری هەڵەبجەو، بەگزادەکانی جافیش هیچ بەرگرییەکیان لەبەردەمیدا پیٚ نەکرا. دەسەڵاتی ئینگلیز تەنها لەبەشێکی وارماوای خوارووی زنجیرە چیای بەرانانی ناوچەی هەڵەبجەدا مایەوە کە بە کفرییەوە بەسترا [1].

لەو سەردەمەدا، ترسو دڵەڕاوکێی خەڵکی بەشێوەیەك بوو کەس نەیدەوێرا بە ڕۆژ لەنێو شاردا بمێنێتەوە، پێش ڕۆژهەڵاتن گەورەو بچووك شاریان بەجیٚ دەهێشتو خۆیان دەگەیاندە دەشتاییو سەرقەبرانو دەوروبەری شار، تا خۆرئاوا خۆیان دەشاردەوە ئینجا دەگەڕانەوە، ئەم حاڵەتە وای کردبوو جگە لەدامودەزگای حکومەتەکەی شێخ لەو ڕۆژانەدا، بازاڕو دوکانیش نەمێنێت، تەنانەت شێخ مەحمود خۆیشی وەك ئەو خەڵکە لەنێو شاردا نەدەماو بەزۆری دەچووە تەکیەی (شێخ مارف) لەسەر قەبران [2].

لەمانگە دواییەکانی ئەو ساڵەدا (1923) تاڕادەیەك ماوەی گەشەسەندنی حوکمڕانی شێخ مەحمود بووە [3]. ڕەنگە هەر لەو کاتانەدا بێت بەگزادە ناسراوەکانی جاف لەوانە (ئەحمەد موختار، عیزەت بەگی برایو حامید بەگ) ڕۆیشتن بۆ سلێمانیو ئەمەکناسیەتی خۆیان بەشێخ مەحمود ڕاگەیاند [4].

هەر لەوڕۆژانەدا ئیدمۆندز لەکەرکوکەوە بەرەو کەلار بەڕێکەوت [5]، لە کەلار چەند نامەیەکی پێگەیشت کە لە هەڵەبجەوە بۆی نێردرابوو [6]، لەوکاتەشدا ئەحمەد موختارو عیزەت بەگی برای لەسلێمانی بوونو هەرکەبیستیان ئیدمۆندز لە کەلارە بەپەلە نامەیەکیان بۆنارد، تیایدا باسیان لەوەکردبوو ئەوان بۆیە ڕۆیشتوون بۆ سلێمانی بۆلای شێخ مەحمود، لایان وابووە کەئەویش (ئیدمۆندز) دێت بۆسلێمانی بۆئەوەی لەویٚ چاویان پێی بکەوێت [7].

لە هەمانکاتدا عادیلەخانمیش نامەیەکی ناردبوو بۆ (ئیدمۆندز)و پێی ڕاگەیاندبوو کە بۆ بینینی دێتە (فەقیٚ جنە) کە ئەوکات ناوەندی ناحیەی (وارماوا) بوو، ئیدمۆندز لە (پەیکوڵی) بە بروسکە خانمی ئاگادارکردەوە کە ناتوانێت بیبینیٚ، بەڵام خانم سەرەڕای زۆری تەمەنی (65ساڵ) بەکوڕەکانیەوە خۆی گەیاندە ناوچەی (پیسەکان) بۆ بینینی (ئیدمۆندز)و گفتوگۆکردن دەربارەی گۆڕانکارییەکانی ئەم دواییەو هەندێك بابەتی تر [8]. بەو دیدارو چاوپێکەتنە سەرلەنویٚ پەیوەندیان لەگەڵ ئینگلیزەکان دامەزراندەوە [9].

لەمایسی 1924ئیدمۆندز چەند نامەیەکی بەدەست گەیشت، کە ڕەخنەیان لە دانانی جافرسان (جەعفەرسوڵتان)ی سەرداری هەورامیەکان دەگرت لە پلەی قایمقامێتی هەڵەبجەدا، ئەوکارەش مەلایەکی ناوچەی هەورامان بەناوی (مەلاحەسەن) [10] پێی هەڵسابوو، دوای ئەوەی ڕۆیشتبووە بەغدادو لەکۆشکی پاشایەتی حوکمێك لەسەر کاغەزی ڕەسمی

---

[1] ـ سدیق ساڵح: سەرچاوەی پێشوو, ل86.

[2] ـ ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: سەرچاوەی پێشوو, ل176ـ177.

[3] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل243.

[4] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو, ل446. د. کەمال مەزهەر: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل40.

[5] ـ ڕەسول هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل547.

[6] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو, ل448.

[7] ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل547.

[8] ـ احمدخواجە افندی: قیام شیخ محمود برزنجی ومردم کرد علیە استعمار بریتانیا درکردستان ,جلد اول ,سنندج, 1380شەمسی, ل111.

[9] ـ سدیق ساڵح: سەرچاوەی پێشوو, ل87.

[10] ـ ڕەسوڵ هاوار دەڵێت: ئەو مەل احەسەنەی کە ئیدمۆندز باسی کردووە، خەڵکی بیارە بووەو لەدواییدا بە مەلا قەوسە ناوبانگی دەرکردووە. (سەرچاوەی پێشوو,ب2 ,ل547)

بۆخۆی بەناوی موفتیو حوکمێکیش بۆ (جافرسان) لەپلەی قایمقامی هەڵەبجە وەرگرتبوو. ئەم کارەش هەروەك (ئیدمۆندز) خۆی باسی کردووە بووەتە جێگای سەرسوڕمانی ئەو[1].

ڕەسوڵ هاوار خۆی لەساڵی 1982دا لەناو دەسنووسەکانی (تۆفیق وەهبی بەگ)دا دەسنوسێکی ئەو (مەلا حەسەن)ەی بەرچاوکەوتووە، کە بێگومان (ئیدمۆندز) داویەتی بە(تۆفیق وەهبی بەگ)، لە پێشەکی ئەو دەسنووسەدا مەلا حەسەن دڵسۆزی خۆی بۆ ئینگلیز پیشانداوەو وتوویەتی کە من ماوەیەکە موچەخۆری ئێوەمو گلەیی ئەوەی کردووە کە ئەو هەورامیەو هەورامیەکانیش زۆربەش خوراونو ئەوان کوردنین، زمانێکی تایبەتیان هەیە، بۆ ئەم مەبەستە نیمچە فەرهەنگێکی نوسیووە تیایدا ویستوویەتی بەرامبەرەکانی بەشێوزاری کرمانجی خواروو بنوسێت، بۆ ئەوەی بۆ (ئیدمۆندز) بسەلمێنێ کەئەو دوو زمانە چەند دوورن لەیەکەوە[2].

لەڕاستیدا دانانی سەردارێکی هەورامی بۆ فەرمانڕەوایەتی کردن بەسەر خەڵکانێکدا کە بەگشتی جاف بوون لەو سەردەمەدا، هەروەك (ئیدمۆندز) ئاماژەی بۆکردووە، جگە لەشەڕو خوێنڕشتن هیچ ئاکامێکی دیکەی نەدەبوو ئەمە لەلایەك[3] لەلایەکی دیکەوە، ئینگلیزەکان بەرژەوەندیەکانی عەشیرەتی گەورەی جافو بەگزادەکانیان بۆبەرژەوەندی سیاسی خۆیان بەباشی دەپاراست[4]، لەبەرئەوە کاتێك ڕاستیەکان ڕوون بوونەوە بڕیارەکەش پوچەڵکرایەوە[5].

لەو ڕۆژانەدا شێخ مەحمود ڕێگای لەچوونی کارمەندە ئیدارییەکانو پۆلیس گرت کە بڕۆن بۆ هەڵەبجە، هێرشیشی کردە سەر قەزاکەو گرووپێکی سوارەی جافی تێك شکاند، کە ئەحمەد موختار ناردبوونی بۆبەرەنگاری هێزەکانی شێخ مەحمود.[6] ئەمەش بووە مایەی مەترسی بۆ عادیلەخانم کە فەرمانڕەوایەتی کردنی ناوچەکە لە ئەستۆی ئەواندا بوو.[7]

ئەحمەد موختار سەرەڕای ئەو تێکشکانەی هێزەکە کە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێزەکەی شێخ مەحمود ناردبووی، لەگەڵ هەموو پۆلیسەکان، کە لە مانگی مارسدا بۆی نێردرا بوو، لە هەڵەبجە مابووەوەو زۆربەی نەوڕۆڵیەکان پشتگیریان دەکرد. گوندەکانی نەوڕۆلی لە دوولاوە وەك زنجیر هەڵەبجەیان لەناو خۆیاندا گرتبوو، بەرگریەکی سروشتیان بەدەوری شاردا پێك هێنابوو[8].

لەسەر داوای عادیلەخانی ژنی وەسمان پاشا، جافرسان هات بۆ یارمەتی دانی جافەکانو ئەحمەد موختاری کوڕی کە لەو ڕۆژانەدا پەلاماری هەڵەبجەو شارەزوور درابوو لەلایەن هێزەکانی شێخ مەحمودەوە کەئەو کات خورماڵو وارماوایان بەدەستەوەبوو[9]. بەڵام هێزەکەی شێخ مەحمود خۆی بۆنەگیراو نەیتوانی بوو لەو سەرکەوتنەی پێشووی کەڵك وەربگرێت، شێخ مەحمود ترسی هەبوو لەپێکدا هەڵپژانی عەشیرەت لەگەڵ هەورامانی لهۆندا لەئەنجامی ئەو کارەدا، لەکاتێکدا کە جافرسان بوو بە پشتگیرێکی گرنگ بۆ جافەکان لە بەرامبەر هێرشی هێزەکانی شێخدا.

[1] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو, ل455.

[2] ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل548.

[3] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو, ل455ـ456.

[4] ـ شێخ لەتیفی حەفید: سەرچاوەی پێشوو , ل120.

[5] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو, ل456ـ457. سدیق ساڵح:سەرچاوەی پێشوو, ل87.

[6] ـ هەمان سەرچاوە, ل456ـ457. سدیق ساڵح: سەرچاوەی پێشوو, ل87.

[7] ـ هادی ڕەشید بەهمەنی: سەرچاوەی پێشوو, ل160.

[8] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو, ل458.

[9] ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل548. جەمال بابانوئەوانی تر: سەرچاوەی پێشوو, ب3, ل358.

لەو ڕۆژانەدا کە ئیدمۆندز بە فڕۆکە سەردانی هەڵەبجەی کرد، جافرسان لەگەڵ (فراوین) لە فڕۆکەخانەی هەڵەبجە لە چاوەڕوانی ئەودا بوون، بەگەیشتنی ئیدمۆندز بە هەڵەبجە، جافرسان پێی ڕاگەیاند کە ئەو ئاگای لەو کارەی مەلاحەسەن نەبووە کە بە نوێنەرایەتی ئەو ڕۆیشتۆتە بەغداو ئەو کارەی ئەنجامداوە، ئەوەشی بەخۆی وتبوو هەرگیز ڕێگە بەخۆی نادات شوێنی نەوەکانی عوسمان پاشا بگرێتەوە کەمافی خۆیانە لەشارەزووردا حوکمڕانی بکەن، تەنانەت ئامادەیە تا ئەو کاتەی حکومەت دەیەوێ لە هەڵەبجە بمێنێتەوەو پشتگیری لەعادیلە خانم بکات[1] .

هاتنی جافرسان لەسەرەتاداو دواتریش گەیشتنی ئیدمۆندز بە هەڵەبجە، عادیلەخانیان هێمن کردەوە، خانم بە ئیدمۆندزی ڕاگەیاند کاروباری ناوچەکە بەم شێوەیە تایەك مانگ ڕاگیر دەکرێت[2] . جگە لەو هێرشەی شێخ لەسەرەتادا بارودۆخی هەڵەبجە بەهۆی ناکۆکی لە نێوان بەگزادەکاندا ئاڵۆز بوو[3] .

لەهاوینی ساڵی 1924 جارێکی تر ئینگلیزەکان دەستیان کردەوە بەبۆردومانکردنی شاری سلێمانی، بۆیە شێخ مەحمود چاری نەماو بڕیاریدا بچێتە دەرەوەو لەدەرەوەی شار ڕوویەڕووی ئینگلیزەکان ببێتەوە[4] . بەم شێوەیە ئەم جارەش دەسەڵاتی شێخ مەحمود لەسلێمانیدا لەژێر فشاری بۆردوماندا کۆتایی پێهاتو لەڕێکەوتی (16ی تەموزی 1924) شێخ مەحمود ناچارکرا سلێمانی چۆڵ بکاتو ڕوویکاتە شارباژێڕو لەگوندی (سیتەك) بارگەی خۆی بخات.

هێزەکانی بەریتانیا لە ڕۆژی (1924/7/19) سلێمانیان گرتەوە، کە هێزێکی تێکەڵ بوو لە (لیڤی)و هێزی حکومەتی عێراقی، بۆ یەکەمجار فەوجی حکومەتی عێراقی توانی بگاتە سلێمانی، ئەم فەوجەش ناوی (موسی الکاظم) بوو. ئینگلیزەکانیش لەگەڵ گەڕانەوەیاندا (چەپمەن)یان کردەوە بەلێپرسراوی کارگێڕی شاری سلێمانیو دەسەڵاتی موتەسەڕیفیان پێدا[5] . دواتر بەفڕۆکە بەیاننامەیەکی ئینگلیز بەسەر هەڵەبجەدا بڵاو کرایەوە، کەداوا دەکات کە کاروباری کارگێڕی شارەکە سەرلەنوێ ڕێك بخرێتەوە، بەیاننامەکە ئەحمەد موختار وەك قایمقامو حامید بەگ وەك جێگری ناسانبوو، سەرەڕای ناردنەوەی هەموو پۆلیسەکان بۆ شارەکە، داواش دەکات کە پابەندبن بە بڕیارو ڕاسپاردەکانی حکومەتەوە.

هەر وەك پێشتر باسکرا، بەگزادەکانی جاف لەپاش سوێند خواردنیان بۆ شێخ مەحمودو گەڕانەوەیان بۆ هەڵەبجە، قەزای هەڵەبجەیان خستە سەر(کفری) کەرکوكو لەسلێمانی دایان بڕی،بە گەڕانەوەی سوپای حکومەت بۆ سلێمانی لەلایەن موتەسەڕیفەوە خرایەوە سەر سلێمانی[6] .

سەر لەنوێ ئینگلیزەکان بە بەیاننامەیەکی تر ئاگاداری خەڵکی ناوچەکانی تانجەرۆو قەزای هەڵەبجەو تیرەکانی جافیان کرد، کە ئەو هێزەی دەنێردرێتەوە بۆ ناوچەکە نابێت ڕێگری لێبکەنو زەرەروزیانی پێبگەیەنن، ئەگەر هەر ڕوداوێك ڕوبدات ئەوە لە ئەستۆی ئەواندا دەبێت، دەبێت باجەکەی بدەن. ئەم بەیانو هەڕەشەیەی ئینگلیزەکان ئەوەی دەردەخست کەحکومەت توانای ناردنی سوپایەکی نییە لەسلێمانییەوە بۆ هەڵەبجە، داوای یارمەتیو هاوکاری لە گوندنشینو عەشیرەتەکان دەکات، بەڵام لەو ترسە ڕزگاریان نەبووە[7] .

---

1 ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو, ل458.

2 ـ هادی ڕەشید بەهمەنی: سەرچاوەی پێشوو, ل161.

3 ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل552.

4 ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل550.

5 ـ ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: سەرچاوەی پێشوو, ل177.

6 ـ ئەحمەد خواجە: چیم دی, ب2, ل70.

7 ـ هەمان سەرچاوە, ل104ـ105.

بەمەبەستی سەرلەنویٚ کۆنترۆڵ کردنەوەی هەڵەبجە، هێزێکی حکومی، بەیارمەتی بەگزادەکانی جاف، لەرێی خانەقین، دەربەندیخانەوە، گەیشتە هەڵەبجە، هاوکات هێزێکی دیکەش لەسلێمانییەوە بەرەو هەڵەبجە بەرێ کەوت، لەدەشتی (قورِی چیا) لەگەڵ لەشکری کوردستان بەسەرکردایەتی شێخ مەحمود، کەوتنە شەرِەوە، لەئەنجامدا نزیکەی (70) کەس لەسەربازو لایەنگرانی لەشکری کوردستان کوژران‌و بریندار بوون. لەسوپای حکومەتیش نزیکەی (500) سەربازیان کوژران‌و برینداربوون. نزیکەی(150) کەسێك لەسوپای ئینگلیز، بەسەرکردایەتی یەکێك لە سەرکردە ئینگلیزییەکان توانیان خۆیان لەجەنگەکە دەربازبکەن‌و بگەرێنەوە بۆ مەخفەری (مووان)، ئەم هێزەی ئینگلیز لەلایەن هێزەکەی شێخ مەحمودەوە گەمارۆدرا، بەلاّم دواتر لەرێگەی گفتوگۆوە هەردوولا لەسەر ئەوە رێکەوتن، کەشێخ مەحمود واز لەهێزەکەی ئینگلیز بهێنی، بەمەرجێك ئینگلیزەکان پەیمان بدەن چیتر بەفرۆکە بۆردومانی گوندەکان‌وخەڵکی بێتاوان نەکەن، بەلاّم ئینگلیزەکان وەك پیشەی هەمیشەییان ئەو پەیمان‌وبەڵێنەی کەدایان بەشێخ مەحمود شکاندیان‌و نەیانبردەسەر، هەر دوابەدوای ئەو رووداوە، فرۆکەکانی ئینگلیز هێرشیان کردە سەر ناوچەکانی شاربازێرو شارەزوور، لە گوندی سیتەك (13) کەس‌و لەچنارەی چوارتا (11) کەسیان کوشت [1].

لە مانگی ئەیلولی1924 جارێکی تر شێخ مەحمود دەستی کردەوە بەدژایەتی کردنی ئینگلیز لەناوچەکانی هەڵەبجەو پێنجوێندا، کە لەو ناوچانەدا دۆستی نزیکی هەبوو وەکو مەحمود خانی دزلّی، پەلاماری هێزەکانی عێراقیدا لەو ناوچەیە. شێخ مەحمود هێزێکی نارد بۆ ئەوەی هەڵەبجە بگرێت، بەلاّم هێزی پۆلیس رێگەی لێگرتو شێخ مەحمود چاری نەما روی کردە سەرسنوری ئێران [2].

لەهەمان ساڵدا، (حەمەی سان ئەحمەد) لە ناوچەی شەمێران پەلاماری هێزەکانی حکوومەتی داو تا خانەقین‌و هەڵەبجەی بەحکومەت چۆڵ کرد [3].

(مام حامید عەبدولاّ)ی خەڵکی گوندی (کانی کەوە)ی ناوچەی شەمێران، کە خۆی یەکێك بووە لەو کەسانەی لەو رۆژانەدا ئاگاداری رووداوەکانی ناوچەی شەمێرانی هەڵەبجە بووە دەڵێت: "لەو رۆژانەدا ناوچەی شەمێران سەر بە عێراق‌و ئینگلیز نەبوو، بەڵکو (حەمەی سان ئەحمەد) کە سەرۆك عەشیرەتی (یەزدان بەخشی) بوو لە ناوچەی شەمێراندا پەیوەندی بەشێخ مەحمودەوە هەبوو، بەڵێنی بەشێخ دابوو هاوکاری بکاتو لە شۆرِشەکەیدا بۆ ئەم مەبەستە (مەحمودی کورِی‌و مەحمودی ئەحمەدی وەسمان)ی نارد بۆئەوەی لەخزمەت شێخ مەحموددابن، ماوەی چوار ساڵ ئەم هۆزە پشتگیری شێخ مەحمودیان کرد، لەئەنجامی ئەم کارەدا حکومەت کردیە سەریان‌و داوایان لێکردن کەباج ومولّکانە بدەن بەحکومەت، بەلاّم خەڵکەکە گوێیان بەو داواکارییەی حکومەت نەدا" [4].

نزیکەی چوار ساڵ ئەودووکەسە لەلای شێخ مەحمود مانەوە، لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا چەندین جار نامەیان لە نێوان (شێخ مەحمود)و ( حەمەی سان ئەحمەد)دا ئاڵوگۆرِیێ کردووە، لەدوایدا لەسەر داوای شێخ مەحمود حەمەی سان ئەحمەدو برازاکەی (محەمەد قادر) سەریان لەشێخ مەحمود داوەو ئامادەیی خۆیان بۆ هاوکاری‌و یارمەتی جوڵانەوەکەی دەربرِیوە. بەدرێژایی ئەم ماوەیە ئەم هۆزە پشتیان کردووەتە میری‌و ئینگلیزو بۆ هیچ کارێك بەدەم داواکاری حکومەتەوە نەرۆیشتوون، زۆرجار لە ئیدارەی میرییەوە لە هەڵەبجە داوایان لێکرا کە باج‌و زەویانەو جوتانە.... هتد بدەن، بەلاّم ئەوان

---

[1] ـ شێخ لەتیفی حەفید: سەرچاوەی پێشوو, ل129ـ130.

[2] ـ رەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل566.

[3] ـ ئەحمەد خواجە: سەرچاوەی پێشوو, ب1, ل82.

[4] ـ رەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل571.

ئەو داواكاریەی حكومەتیان ڕەتكردەوە، ئەو پەیمانەشی كە دابوویان بە شێخ مەحمود (هاندەرەكەی لایەنی ئاینی بووە) هێنایانە دیو سوریش بوون لە سەری.

لەكاردانەوەی ئەم هەلوێستەی ناوچەی شەمێران و حەمەی سان ئەحمەدی سەرۆكی ئەم عەشیرەتەدا، (كاپتن لین-لیس)[1] هێزێكی پێك هێنا لە بەڕێوەبەری ناحیەی (قەقێ جنە)، كە (حسەین بەگی حەسەن بەگ) بوو، لەگەڵ (30) پۆلیسو خاوەن موڵكی ناوچەكە (حەسەن بەگ) لەگەڵ هەندی دەستەو دایەرەی تری خۆیاندا،[2] لێپرسراوی ئەم هێزەش (عەبەبەران) بوو، كە كەسێكی زۆر دڵڕەق‌و توندوتیژ بووە، ئەم هێزە ڕۆشتنە گوندەكانی ناوچەی شەمێران‌و داوایان كرد هەر گوندە (40) لیرە بدات بە حكومەت، بەڵام حەمەی سان ئەحمەد لەم هێزە ڕاپەڕی‌و پۆلیسەكان بە پەلە ناوچەكەیان بەجێهێشت[3].

لە دوای تێپەڕبوونی دوومانگ بەسەر ئەو ڕووداوەدا، فڕۆكەیەكی ئینگلیز بەیاننامەیەكی بەسەر ئاوایی(كانی كەوە)ی ناوچەی شەمێراندا بلاوكردەوەو داوای لێیان كرد یان دەبێت ملكەچی بڕیارو ڕاسپاردەكانی حكومەت بن یاخود ناوچەكەیان بۆمباران دەكرێت. بەڵام حەمەی سان ئەحمەد بڕیاری ملكەچ نەكردنی داو، داوای لەخەڵكی گوندەكان كرد گوندەكانیان چۆڵ بكەن و ڕوو بكەنە ئەشكەوتە گەورەكانی ناوچەكە، پاش چەند ڕۆژێك (5) فڕۆكەی ئینگلیز هاتنە سەرگوندی (كانی كەوە) و بەخەستی بۆمبارانیان كرد، لە كاتی ئەم بۆمبارانەدا حەمەی سان ئەحمەد بە تفەنگێكی تەیارە شكێن یەكێك لەفڕۆكەكانی ئینگلیزی خستەخوارەوە[4]، بەڵام فڕۆكەوانی نێو فڕۆكەكە توانی بەهۆی فڕۆكەیەكی ترەوە خۆی ڕزگاربكات. شەوەكەی نامەیەك لە كاپتن (لین)ەوە گەشتە دەست حەمەی سان ئەحمەدو تیایدا داوای لێكردبوو ئەگەر فڕۆكەكە نەسوتێنن ئێمە لێیان خۆش دەبین وهیچ لەتێوانماندا نامێنێت، بەڵام حەمەی سان ئەحمەد بڕیاریدا فڕۆكەكە بسوتێنێ، لەبەرئەوەی فڕۆكەی ئینگلیزەو بۆردومانی كردوون. دوای سوتاندنی فڕۆكەكە جارێكی ت ڕچوار فڕۆكەی ئینگلیز هاتنەوە سەر ناوچەكەو بەخەستی بۆمبارانی ناوچەكەیان كردەوە[5].

پاش ساڵێك بەسەر ئەو ڕووداوانەدا، ئینگلیزەكان داوای دیدارو گفتوگۆیان كرد لەگەڵ حەمەی سان ئەحمەد بۆ ئەوەی لەهەموو شتێك بیان بەخشن، ئەوەشیان پێگوت ئەگەر خۆشی بڕواناكات با كوڕەكەی بنێرێت بۆگفتوگۆ بۆلایان، بۆئەم مەبەستە ئەویش لەسەرداواو پێداگرتنی موختارەكان (مەحمودی كوڕی‌و ئەحمەد حسێن)ی نارد بۆ هەڵەبجە، هەربەگەشتنیان بۆ هەڵەبجە كاربەدەستانی ئینگلیز گرتنیان‌و خستنیانە بەندیخانە، جوابیشیان نارد بۆ حەمەی سان ئەحمەد هەتاوەكو خۆی نەیەتە هەڵەبجەو ڕووبەڕوو نەبێتەوە لەگەڵیان بەریان نادەن، بەڵام حەمەی سان ئەحمەد هەرزوو زانی كەئەوە پلانێكەو پەیوەندی بەخودی خۆیەوە هەیە، لەبەرانبەردا حەمەی سان ئەحمەد نامەی یارمەتی‌و بەدەنگەوە هاتنی بۆ (حەمە ئاغای) سەرۆكی گەلاڵی‌و (عەبدولا محەمەد خواكەرەم)ی سەرۆك عەشیرەتی نەوروڵی‌و تایفەی تاوگۆزی

---

[1] ـ پێشتر باسمان لەوەكرد كە (كاپتن لین) لە ئازاری 1919 تاوەكو كانونی دووەمی1921 حاكمی سیاسی هەڵەبجە بوو. بۆیە بە بڕوای ئێمە ئەو كاپتنە دەبێت ئەو (فۆن لاین)ە بێت كە ئیدمۆندز لەساڵی 1924دا باسی دەكات لەكاتی پەلامارەكەی شێخ بۆسەر هەڵەبجە و ڕۆیشتنەكەی خۆی بۆ ئەو شارە, لەوكاتەدا جافرسانیش میوانی ئەو (فۆن لاین)ە بووە.

[2] ـ ڕەئوف مەحمود: لاپەڕەیەكی شكۆداری سەردەمی شێخ مەحمود, گۆڤاری(بەیان), ژ(151), 1989, ل20-21.

[3] ـ هەمان سەرچاوە, ل21

[4] ـ ڕەئوف ئەحمەد: سەرچاوەی پێشوو, ل21.

[5] ـ هەمان سەرچاوەی, ل21.

نارد، ئەوانیش لەشکرێکی گەورەیان پێکەوە ناو بڕیاریاندا بەرەو هەڵەبجە بڕۆن‌و دەستی بەسەردا بگرن، کاتێک ئینگلیزەکان بەمەیانزانی بەپەلە (مەحمودو ئەحمەد حسێن)یان ئازاد کرد.

بارودۆخ بەم شێوەیە مایەوە ئەوکاتەی شێخ مەحمود بەرەو لاوازی ڕۆیشت، لەلایەکی ترەوە سانیش ئەو توانایەی جارانی نەما، ئینگلیزەکان گرتیان‌ویۆماوەی (40) ڕۆژ بەدەست بەسەری برا بۆخانەقین، دواتر ئینگلیزەکان دادگاییان کردو کۆمەڵێك تۆمەتیان ڕووبەڕووکردەوە لەوانە تۆمەتی سەرپێچی بڕیاری حکومەت‌و نەدانی زەویانە بەڵام دواتر ئازادکرا[1].

ئەحمەد موختار لە خولی یەکەمی پەرلەمانی عێراقدا کە لە (1925/7/16بۆ 1928/10/28) خایاند وەکو نوێنەری شاری سلێمانی بوویەئەندام*، دوای ئەحمەد موختار، حامید بەگی برازای کەپێشتر جێگری بوو کراوە بە قایمقامی هەڵەبجە لەماوەی ساڵانی(1925ـ1932)[2]، کاتێك حامید بەگ هاتە سەرکار، پشێوی‌ر ئاژاوە لەناو شاردا بڵاوبووبوویەوە، بۆئەم مەبەستە دەبوایە حامید بەگ یاسایەکی توندوتیژی پەیڕەو بکردایە، تاکوبیتوانیایەبارودۆخی شار هێمن بکاتەوە لەدەستی پیاو خراپ و ڕێگرو هەندێك کاری دزێوو ناشیرین کە لە شاردا بڵاوبوویەوە، لەبەرئەو هۆیانە خۆی بەناو شاردا دەگەڕاو ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی کاروباری شاری دەکرد[3].

لە بەهاری ساڵی 1925 کە ئەوکات شێخ مەحمود بنکەی شۆڕشی گواستبووەوە بۆ پێنجوێن، هێزێکی گەورەی کۆکردەوەو، بەرەو شارەزوورو هەڵەبجە بەڕێکەوت. کوێخاو خەڵکانێکی زۆر لە گوندەکان (بناری چەوتان‌و کۆنەدێ‌و بانی بنۆك‌و شانەدەری‌و خرپنوك‌و سیامێوەو چۆمەڕەسی) لەگەڵ چەکدارەکانی عەشیرەتی (غەوارە) دا پەیوەندیان کرد بەشێخ مەحمودو هێزەکەیەوەو پشتگیری خۆیان بۆ شێخ دەربڕی. ئەم هێزەی شێخ مەحمود هێرشی کردە سەرناوچەی شارەزوور، ئامانج لەم هێرشەش بڕینی ڕێگای هاتوچۆی نێوان بەغداوکەرکوك‌و خانەقین بووە.

لە مانگی مایسی1925 هێزێکی لیڤی سوارە نێردرا بۆ سلێمانی‌و هەڵەبجە کەئەوکات ئەو ناوچەیە زۆر نائارام بوو، بەڵام لە حوزەیرانەوە بارودۆخەکە بەرەو باشتر ڕۆیشت، ئەو پرۆسە سەربازیانەی کەلەلایەن ئینگلیزەکانەوە ئەنجام دران دژی شێخ مەحمود، شێخیان ناچارکرد بچێتە خاکی ئێرانەوەو لەناوچەکانی مەریوان‌و هەوراماندا هاتوچۆی دەکرد[4]. کاتێك شێخ وهێزەکەی گەیشتنە خورماڵ حامید بەگی کۆنە دۆستی شێخ مەحمود خۆی گەیاندە لای، هەمان ڕۆژ تۆ فڕۆکەی ئینگلیز هاتە سەرناوچەکە، بەڵام ڕۆژەکەی فڕۆکەکان بۆردومانی ناوچەکەیان نەکرد، بۆ شەوەکەی هەروەك شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحمود باسی دەکات هاوڕێ دڵسۆزەکەی شێخ مەحمود، حامید بەگی جاف ترساو شێخی بەجێهێشت‌و گەڕایەوە بۆ هەڵەبجەو ڕۆشتەوە پاڵ حکومەت، حامید بەگ وەفدێکی بەقورئانێکەوە نارد بۆلای شێخ مەحمود، چونکە حامید بەگ دەیزانی شێخ مەحمود بەر لەوەی پیاوێکی سیاسی بێت، پیاوێکی ئاینییە.وەفدەکە بەشێخ مەحمودیان ڕاگەیاند، کەحامید بەگ پەیمانی داوە، پاش ماوەیەکی تر، بەشداری شۆڕش دەکاتەوەو، هەڵەبجەش دەداتە دەست شۆڕشگێڕانی کوردستان. بۆیە شێخ مەحمود لەسەرداوای حامید بەگ وازی لەگرتنی هەڵەبجە هێنا.

[1] ـ هەمان سەرچاوە, ل21.

* ـ جگە لەخولی یەکەم، ئەحمەد موختار لەخولی سێیەمیشدا (1930/11/1بۆ 1932/11/1) وەکو نوێنەری شاری سلێمانی هەڵبژێردراوەتەوە. (عبدالرزاق الحسني: تاريخ الوزارات العراق, ج10, دارالشؤون الثقافة, بغداد, 1988, ص293)

[2] ـ د. عبدالرزاق الحسني: تاريخ الوزارات العراق, ج10, دارالشؤون الثقافة, بغداد, 1988, ص292 .

[3] ـ جمال بابان: اعلام كرد العراق , سليمانية, 2006, ل226.

[4] ـ بەکر حەمەصدیق عارف: لاپەڕەیەك لە, ل16.

[5] ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل585.

پاش ئەمە شێخ مەحمود هەندێك لەهێزەکەی ڕەوانەی ناوچەی سەنگاوو شێروانە کرد، هێزێکی سوارەی دیکەشی بۆ عەربەتو خەراجیان نارد، هێزێکی دیکەی بۆ بناری دسکەرەو شەمەوێلە نارد، خۆشی لەگەڵ ژمارەیەك لەهێزەکانیدا ڕووی کردە ناوچەی(سەیدسادق)، کەئەوکات (سەیدسادق) ناوچەیەکی چۆڵ بوو. شێخو هێزەکەی ئەشکەوتەکانی سەیدسادقیان کردبووە شوێنی حەوانەوەی خۆیان، بۆ ماوەیەك مستەفا عەلی، کەیەکێك بوو لەکوێخاکانی جاف داوای لەشێخ دەکرد کە نانی یەك مانگی ئەم هێزەی شێخ مەحمود لەسەر ئەوبێت، ماوەی (18) ڕۆژ ئەو پیاوە خزمەتی خواردنی بۆ دابین کردن، دواتر شێخ مەحمود ئەوێ ی بەجێهێشتو ڕووی کردە شانەدەری.[1]

لەڕۆژی 1930/1/8 شێخ مەحمود لە (باخەکۆن)ی ناوچەی هەورامان میوانی شێخ حوسامەدین بوو، نامەی نارد بۆ بەڕێوەبەری ناحیەی خورماڵ کە(سەعید ئەفەندی جعیتی) بوو، لە نامەکەدا ئەوەی بە بەڕێوەبەر ڕاگەیاند کە دەیەوێت خورماڵ بگرێت، بەڵام نایەوێ شەڕو کوشتار ڕووبدات، داواشی لەسەعید ئەفەندی کرد کەبەپەلە وەڵامی نامەکەی بداتەوە، سەعید ئەفەندی شێوەی ئەم نامەیەو جۆری داواکارییەکەی شێخی بەسوارێکدا دەنارد بۆ قایمقامی هەڵەبجە(حامید بەگ)، داوای لێکرد بەپەلە وەڵامی بداتەوەو بگاتە خورماڵ، لە هەمان کاتدا بەڕێوەبەر بە نامەیەك داوای لە شێخ مەحمودکرد تا سبەینێ عەسر پەلەنەکات، بەڵام بەهۆی نەگەڕانەوەی وەڵامی نامەکەی سەعید ئەفەندی لە هەڵەبجەوە دواکەوتنی وەڵامەکە، هەرچەندە ماوەی نێوان هەڵەبجەو خورماڵ لە30کم تێپەڕناکات، شێخ مەحمود لە 1930/1/9 دوای تەواوبونی ماوەکە لەدوای عەسر هاتە خورماڵەوەو دەستی بەسەر ناحیەکە داگرت، هەموو چەكو تفاقی ناحیەکەشی برد، ئەوڕۆژەش لەماڵی(سەعید ئەفەندی)میوان بووەو خزمەت کراوە، دوای گرتنی ناحیەکە لەلایەن شێخەوە وەڵامی نامەکە بە پۆستەچییەکدا لە هەڵەبجەوە گەیشتە خورماڵ، بەڵام تازە کار لەکار ترازابوو، نامەکە داوا لە سەعید ئەفەندی دەکات کە بەرگری بکاتو ڕێگە بەهێزەکانی شێخ نەدات ناحیەکە بگرن.[2]

کاتێك کە کارەساتی 6/ئەیلول/1930 لە سلێمانی ڕوویدا ئەحمەد موختار بەمشێوەیە باسی ئەو ڕووداوەی کردووە:

شەشی ئەیلول ئەزانن ئێوە ئەی قەومی وەفادار

ئەوە ڕۆژێ بوو دوژمن قەتڵوعامی کوردەکانی کرد[3]

لە ڕۆژی 1931/6/11دا مەلیك فەیسەڵ لە چوارچێوەی سەردانێکیدا بۆ شاری سلێمانی سەردانی شاری هەڵەبجەشی کرد، مەلیك فەیسەڵ لە ڕۆژی 1931/6/12 لە کاتژمێر (5)ی سەرلەبەیانی بە هاوڕێیەتی موتەسەریفی سلێمانیو موفەتیشی کارگێڕی (ئیداری)و ئامیری ناوچەی ڕۆژهەڵات بەرەو هەڵەبجە بەڕێکەوت، بەرلەگەیشتنی بەشاری هەڵەبجە لەناحیەی خورماڵ لەلایەن کۆمەڵێك لەسەرۆك عەشیرەتو خەڵکی ناوچەکەوە پێشوازی لێکرا. پاشان لەخورماڵەوە بەرەو هەڵەبجە بەڕێکەوت، شارەوانی هەڵەبجە مەراسیمێکی گەورەی لەدەروازەی شاردا بۆ پێشوازی کردن لەمیوانەکان سازدابوو، خەڵکانێکی زۆر لە دەروازەی شاردا لەچاوەڕوانی هاتنی (مەلیك فەیسەڵ)دا بوون، لەسەرو هەموویانەوە سەرۆکو بەگزادەکانی جافو خەڵکانی ناسراوی ناوچەی هەورامانو نەوروڵیو شێخانی تەریقەتی نەقشبەندی بوون، کە ئەمانە پێشوازییەکی گەرمیان لە مەلیکو هاوڕێکانی کرد بۆ شاری هەڵبجە، دوای بەخێرهاتن مەلیك فەیسەڵو میوانەکان بەمەبەستی حەوانەوە ڕوویان لە ماڵی حامید بەگی قایمقامی هەڵەبجە کرد، پاش کەمێك لەپشوودان مەلیك فەیسەڵ سەردانی قوتابخانەیەکی سەرەتایی شارەکەی کرد، کە قوتابییەکان پۆل پۆل لەپێشوازی مەلیك دابوونو بەخێرهاتنیان

---

[1] ـ شێخ لتیفی حەفید: سەرچاوەی پێشوو, ل131ـ132.

[2] ـ ع. بەسۆز: ئاوڕێکی تر بەرەو شۆڕشەکانی شێخ مەحمود, ڕ(کوردستانی نوێ), ژ(1570) ,1998/3/5.

[3] ـ د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ: سەرچاوەی پێشوو,ل71، عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل180.

کرد. جەلالی حامید بەگ کەیەکێك بوو لە قوتابییەکانی ئەو قوتابخانەیە وتەمەنی (8)ساڵ بوو شیعرێکی خوێندەوە، لەدوای ئەو خوتبەیەکی ترخوێندرایەوە، دواتر مەلیك فەیسەڵ قوتابخانەکەی بەجێهێشتو گەڕایەوە بۆشاری سلێمانی .[1]

حامید بەگ تا ساڵی 1932 قایمقامی هەڵەبجە بووە،[2] لەدوای ئەم مێژووە حکومەتی عێراقی وەکو حکومەتی عوسمانی سەردەمی(ئیتیحادوتەرەقی)تورك خۆیان قایمقامیان بۆهەڵەبجە دادەنا، لێرە بەدواوە لەسەرئەم شێوەیە حکومەتەکانی ئایندەی عێراقی دەرۆیشتن‌و قایمقامیان بۆ هەڵەبجەدادەنا .[3] (حامید بەگ)یش لەسەرەتای ساڵی1933دا گوێزرایەوە بۆ چەمچەماڵ‌و کرا بە قایمقامی ئەو شارە .[4] ئەحمەد موختاریش لەشوباتی 1935دا لەسەر ڕووباری سیروان‌و لەنزیك شاخی(نوەر) کوژرا.[5] ئەحمەد موختار ماوەیەك بەرلەکوشتنەکەی‌وتەنانەت لەکاتی کوشتنەکەیدا لەبەرچەند هۆکارێك لەدەوڵەتومیری یاخی بووبوو کەچەندچەکدارێکیشی لەگەڵدابوو.[6]

شەمسەی کچی ئەحمەد موختار دەڵێت: "ئەوسەردەم باوکم خەریکی کوردایەتی بوو، ڕۆشتبووە دەرەوە بۆشاخ، لەگەڵ خەڵکانێکدا کەزۆربەیان کۆکۆیی‌وزەردۆیی بوون، دواتر بڕیاری گەڕانەوەیاندابوو بۆئەم مەبەستە ئەحمەد موختار،(عەلی یەفەنی هەمپەڵی) ڕاسپاردبوو کەبڕواتە لای (جەمال بابان)لەسلێمانی هەتاوەکو ببێتە واسیتەیان‌وبێنەوەعێراق،چونکە ئەوکات جەمال بابان موتەسەریفی سلێمانی بوو".[7] بەهەرحاڵ ئەحمەدبەگ لەسەردەمی یاخیبوونیدا لەحکومەت لەڕێکەوتی5/شوباتی/1935دا لەسەر ڕووباری سیروان کوژراو تەرمەکەی هێنرایەوە بۆهەڵەبجەولەگۆڕستانی (عەبابەیلێ)و لەنزیك گۆڕی تاهیر بەگی برای بەخاك سپێردرا .[8]

---

[1] ـ هەرلەو ڕۆژەدا شەمسەی کچی ئەحمەدموختار وەکو خۆی دەگێڕێتەوە ئەم پارچە شیعرەی نوسیبوو لەبەردەم (مەلیك فەیسەڵ)دا خوێندییەوە:

مەخفەری دوەل فەیسەڵی ئەوەڵ   هەروەکو لەڕۆژی لەبورجی حەمەل

جالیسی تەختی خولەفای عەباسی  بەعەدل‌وئیحسان بەخواشناسی

فەرزە تەعزیمت بەدڵ‌وبەگیان  لازمە حوبیت بەقەول‌و ئیمان

شوکری هاتنت بەجێ ئەهێنم  گۆرانی کوردیت لەبۆ دەخوێنم

ئارام عەلی سەعید: قولەکانی ماڵی پاشا شوێنی نووسینی شیعری ئەحمەدموختاربەگی جاف بوو, ڕ(کۆمەڵ), ژ(232), 22/7/2006.

[2] ـ نەوشیروان مستەفا ئەمین: کوردستانی عێراق, سەردەمی قەڵەم‌و موراجەعات, دەزگای چاپ‌و پەخشی سەردەم,سلێمانی,1999, ل207.

[3] ـ بەکرحەمە صدیق عارف: لاپەڕەیەك لە,ل16.

[4] ـ حەسەن فەهمی بەگی جاف: سەرچاوەی پێشوو, ل62.

[5] ـ جمال بابان: مصدرالسابق, ص226.

[6] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل296.

[7] ـ هەمان سەرچاوە, ل297.

[8] ـ ئارام عەلی سەعید: سەرچاوەی پێشوو.

[9] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل298، د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ: سەرچاوەی پێشوو, ل23.

## باسی دووەم: پەیوەندی نێوان هەڵەبجەو دەسەڵاتدارانی بەریتانی

بایەخپێدانی ئینگلیز بەکوردستان لەسەرەتای سەدەی بیستەوە زیاترپەرەی سەندوئەمەش ئەنجامی دۆزینەوەی نەوتو ئەوبایەخە زۆرەبوو کەئینگلیز بەمیسۆپۆتامیای دابوو کە دەیانویست بەباشوری کوردستانەوە بیکەنە بنکەیەکی گرنگی بڵاوکرنەوەو پاراستنی دەسەڵاتیان لەرۆژهەڵاتی نزیکو ناوەڕاستدا. لەم سەردەمەدا ژمارەی ئەوئینگلیزانەی دەهاتنە کوردستانو پیایدا دەگەڕان لەزیادبووندابوو، هەندێکیان پێش هاتنیان فێری زمانی کوردی بووبوون کەئەمەش یارمەتیەکی زۆریدان بۆ لێکۆڵینەوەی باری ژیانی کوردو وڵاتەکەیان لەهەموو ڕوویەکەوە،لەم بارەیەوەگەشتە بەناوبانگەکەی (مێجەرسۆن)و نووسینەکانی نمونەیەکی ڕوون وئاشکران.

مێجەرسۆن پاش ئەوەی ساڵێکی (1906ـ1907) لە کرماشان بردەسەرو کوردییەکی باش فێربوو، لەساڵی 1907 کەوتەگەڕان بەکوردستانی خوارووبا لەنزیکەوە لەژیانی کوردو باری کوردستانی کۆڵییەوەو پەیوەندیەکی ئێجگار نزیکی لەگەڵ هەندێك لەسەردارەکانی (جاف)دا دامەزراند[1].

(سۆزان مێسلاس)ی ئەمریکیش باسی لەوە کردووە کەمێجەرسۆن دوای هاتنی بۆناوچەکە پەیوەندی پەیداکردووە لەگەڵ هەندێك لەسەرۆك هۆزەکانی ناوچەکەدا، لەوانە جاف‌وپشدەر[2]. شارەزایی ئەو لەناوچەکانی کوردستانو ئەوزمانانەی قسەی پێ کردون وئەوەی کەخۆی بەموسوڵمان ناساندبوو، بەگشتی ئەو هەوڵەیان بۆ ڕەخساند کەزانیارییە کۆکراوەکانی ببنە بەڵگەیەکی باوەڕپێکراو[3].

ئینگلیزەکان هەر لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانییەوە وردە وردە پەیوەندیان لەگەڵ هۆزو خێڵە جیاوازەکانی کورددا بەست، ئەوەبوو هەر لەدوای داگیرکردنی بەغداد، ڕاستەوخۆ ئینگلیزەکان ژمارەیەك ئەفسەری لێهاتوو بەتایبەت ئەوانەی کەمەشقی تایبەتیان لەهیندستان بینی بوو، یان پێش جەنگ لەکوردستان ژیابوون، ناردنیان تا پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ کوردەکاندا گرێ بدەن، بەتایبەتیش لەگەڵ سەرۆك هۆزەکانی کورددا، (مێجەرسۆن)یش یەکێك بوو لەو ئەفسەرانەی کە چەند جارێك سەری لەناوچەکانی کوردستاندا لەو قۆناغەی ئەوسای جەنگدا[4].

سۆن کە لەساڵی 1909 بەخۆگۆڕینو ناوی نهێنی (میرزا غوڵام حسەینی شیرازی) ڕۆیشتبووە شاری هەڵەبجەو ماوەی شەش مانگ خزمەتکاریماڵی عوسمان پاشای جاف بوو، سۆن کەبەیەکێك لەکوردناسە بەناوبانگەکان دادەنرێت لەو ماوەیەدا بە هەردوو زمانی کوردیو فارسی بەباشی قسەی دەکردو هیچ کەس هەستی پێ نەدەکرد کەئەو ئینگلیزە[5]. تا ڕۆژێك تاهیر بەگ لەکاتی گفتوگۆکردندا ئەوەی بۆئاشکرا بوو کەسۆن ئێرانی نییەو بەڵکو ئینگلیزە. جگە لەم پێزانینەی تاهیر بەگ چەندهۆکارێکی تریش وایان لەسۆن کرد کەهەڵەبجە بەجێبهێڵێت ئەوانیش:

یەکەم: ئەمین ئەفەندی ناوێك کەگاورێکی ئەڵمانی بوو، بەهەمان شێوەی مێجەرسۆن خۆی کردبوو بەموسوڵمانێکی ئێرانیو دکتۆری ماڵی خانم، سۆن ترسی لێ ی هەبوو ئاشکرای بکات، چونکە ئەمین ئەفەندی ڕقی لەسۆن بوو حەزی بەمانەوەی نەدەکرد لەماڵی خانم دا، چونکە جێگەی ئەو لێژدەکرد.

---

[1] ـ د. کەمال مەزهەر: کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا, چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد, بەغدا, 1975, ل15ـ17.

[2] ـ Kurdistan in the shadow of history < p 77

[3] ـ ئەدۆنس: سەرچاوەی پێشوو, ل49.

[4] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل227ـ228.

[5] ـ مارف خەزنەدار: مێژووی ئەدەبی کوردی, ب4,چ1, دەزگای چاپ وبڵاوکراوەی ئاراس, هەولێر, 2006, ل565.

دووەم: لەئەستەمبوڵ (شیخ الاسلام)ی سنە چاوی بەسۆن کەوتبوو، گومانی لەموسوڵمانێتی سۆنو،هەروەها لەرەگەزیشی هەبوو، لەوڕۆژانەشدا (شیخ الاسلام) لەبیارەبوو دەیویست سەردانی هەڵەبجە بکات، سۆنیش دەترسا بیبینێو ئاشکرای بکات، بۆیە بڕیاریدا هەڵەبجە بەجێبهێڵێت.[1]

هەموو ئەمانەونوسینەکانی لەدوایدا بەنیسبەت ئینگلیزەکانەوە جێگەی تەواوی خۆیان گرت، لەدەورویەری کۆتایی شەڕدا جێبەجێکردنی گەلێك ئەرکی گرنگی لەباشوری کوردستاندا پێ سپێردرا، هەردوای داگیرکردنی بەغداد لەلایەن ئینگلیزەکانەوە سۆن بەرەوخانەقین کەوتەڕێ. دوای کۆتایی هاتنی شەڕیش بەناوی ئەفسەری سیاسی بەریتانیاوە ڕۆڵێکی گەورەی لەچەسپاندنی دەسەڵاتی ئینگلیزەکان لەباشوری کوردستاندا بینی.[2]

بەر لەوەی باس لەدەسەڵاتی راستەوخۆی ئینگلیزەکان بکەین لەو شارەدا، بەپێویستی دەزانین کەمێك هەڵوێستە لەسەر بارودۆخی شاری هەڵەبجە لە دوارۆژەکانی دەسەڵاتی عوسمانی لەوناوچەیەداو هەوڵەکانی ئینگلیز لەو سەردەمەدا بۆ کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتی ئەوان نەك هەر لەو شارە، بەڵکو لە هەموو ناوچەکانی ویلایەتی موسڵدا بکەین.

لەڕاستیدا هەوڵو کۆششی ئەو سەردەمەی ئینگلیز زیاتر بۆ ئەو مەبەستەبوو کەسەرۆك هۆزەکانو کۆمەڵانی خەڵك بەلای خۆیاندا ڕابکێشنو لەهەمان کاتدا دژی تورکەکان بوەستن.[3] دوای داگیرکردنی خانەقین لەلایەن ئینگلیزەکانەوە لەساڵی 1917دا، ئینگلیزەکان هێزیکی (3000) سەربازی کەلەعەشایرەکانی ئەوناوچەیە پێك هاتبوو وموچەخۆری ئەوان بوون لەگەڵ ژمارەیەك ئەفسەری سیاسیو سەربازی شارەزای خۆیاندا ناردە ناوچەی (هۆرێنو شێخان). کوڕو برایەکی شێخ نەجمەدینو سەید سلێمانی خانەقینی هاوڕێیەتی ئەو هێزەیان کرد. هەرلەو ڕۆژانەشدا عەلی بەگی کوڕی مەحمود پاشای جاف لەلایەن باوکییەوە نێرردرابوو بۆ خانەقین بۆ هێنانی هەندێك چەكو تەقەمەنی جەنگ.

هەرلەم کاتەدا لەسەر ڕاسپاردەی پیاوانی سیاسیو سەربازی ئینگلیز لەڕێگەی (عەشیرەتی گەورەی جافو یەزدان بەخشی)یەکانەوە دەستکرا بەبڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە دژی دەسەڵاتی عوسمانی لەناوچەکەدا. هاوکات ژمارەیەك لە ئاواییەکانی ناوچەی تاوگۆزیو ژمارەك لەخزمانو خانەوادەی شاعیری گەورەی کورد(مەولەوی) کەهەریەك لەو ئاواییانە خاوەنی(30تا40) چەکداربوون بەسەرکردایەتی سەید مەحمودی مەولەوی کەئەمیش لەژێر ڕاسپاردەو بڕیاری مەحمود پاشادا کاری دەکرد پەیوەندیان کرد بەوهێزەی ئینگلیزەکانەوە کە هاتبوونە ناوچەی هۆرێنو شێخان. لەم ڕۆژانەشدا عەلی ئەکبەرخان[4] کەلەترسی ئینگلیزەکان پەنای بردبووە بەردەوڵەتی عوسمانی لەپشت قەڵای شەمێرانو لەماڵی محەمەد تەقی بەگ دا بوو کەیەکێك بوو لەسەرۆك عەشیرەتو گەورەپیاوەکانی ناوچەکە.[5]

---

[1] ـ مەحمود عەزیز: سەرچاوەی پێشوو, ل31ـ32.

[2] ـ د. کەمال مەزهەر: کوردستان لەساڵەکانی , ل17 .

[3] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل228.

[4] ـ دوای داگیرکردنی شاری (کرند) لەلایەن ئینگلیزەکانەوە, ئینگلیزەکان داوایان لەعەشیرەتی سنجابی کرد کەوەك هۆزەکانی تری ناوچەکە هاوکارییان بکەن بۆدژایەتیکردنی هەردوو دەسەلاتی عوسمانی وئێرانی لەناوچەکەدا, بەلاّم بەهۆی ئامادەنەبوونی ئەوعەشیرەتە بۆهاوکاریکردنی ئەوان, هێزەکانی ئینگلیز لەکارەساتی(دەشتی حەڕ)دا کوشتوبڕێکی گەورەیان لەهۆزە کردو سەرداری ناسری سەرۆکی ئەو عەشیرەتەشیان گرتو رەوانەی بەغدادیان رکرد. عەلی ئەکبەرخانیش بەخۆیو(60) سەربازی عەشیرەتەکەیەوە پەنای بردەبەر دەوڵەتی عوسمانی, سەرەتا هاەناوچەی شەمێران پاشان لەسەرداوای کاربەدەستانی عوسمانی لەهەڵەبجە, رێگای هەڵەبجەی گرتەبەرو ماوەیەك لەوشارە مایەوە.(د.کریم سنجابی: سەرچاوەی پێشوو, ل537)

[5] د.کریم سنجابی: سەرچاەی پێشوو, ل533ـ534.

پێشتر عەلی ئەکبەرخان دوونامەی ناردبوو بۆ(شێخ نەجمەدین و شێخ حسامەدین)کە دووشێخی گەورەی تریقەتی نەقشبەندی ناوچەکەبوون(هەڵەبجەو شارەزوورو هەورامان)، کەکاریگەری باشیان هەبووە لەسەر خەڵکانی ئەو ناوچەیە، بەناوی ئیسلامەتیەوە داوای لێکردن کە یارمەتیو هاوکاری بکەن بۆ وەستان دژی ئینگلیزەکان کەبەدوژمنانی ئیسلام ناوی بردون، عەلی ئەکبەرخان پێشتر پەیوەندی لەگەڵ شێخ حسامەدیندا هەبوو، شێخ حسامەدین ئامادەیی خۆی بۆ هاوکاریکردنی دەربڕیبوو، ئەوەشی گوتبوو ئەگەر دەوڵەتی عوسمانی هەزار سەربازی بهێنێتە ناوچەکانی هەڵەبجەو هەورامان ئەوا ئەو لەتوانایدایە تەواوی هۆزو خێڵەکانی ئەو ناوچەیە بکات بەپاشکۆی ئەو هێزە. هەرچی شێخ نەجمەدینە هەرچەندە بەشێوەیەکی دۆستانە وەڵامی دابووەوە، بەڵام ئەوان پەیوەندیان لەگەڵ ئینگلیزەکاندا باش بووە، خۆیو شێخ کامیلی برای پێشتر لەگەڵ ئینگلیزەکاندابەشدارییان کردبوولەکوشتنی کاپتن (شولتسی)ی ئەڵمانیدا، هەروەها کوڕەکەشی لەخانەقین موچەی لەلای ئینگلیزەکان وەردەگرت، ئەوان لەگەڵ جافرسانی هەورامیو عەشایری جافی مورادی خەریکی شۆرش کردن بوون دژی عوسمانیەکان لەوڕۆژانەدا.[1] لەوڕۆژانەدا عەشیرەتی گەورەی جاف بوونی حکوومەتی تورکیان لەلانەبوەو بەچەکی چاك چەکدار کرابوون.[2]

عەلی ئەکبەرخان هەواڵی گەیشتنی هێزەکانی ئینگلیزی بەناوچەی هۆرێنو شێخان گەیاندە دەسەڵاتدارانی عوسمانی لەهەڵەبجە. بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئینگلیزەکان، زیائەدین بەگ فەرماندەی هێزەکانی سنور بەکۆمەڵێك چەكو تفاقی جەنگییەوە خۆی گەیاندە هەڵەبجە، هاوکات عەلی ئەکبەرخان نامەیەکیشی لەڕاوێژکارەکەی (مستەفابەگ)ی فەرماندەی هێزەکانی عوسمانی لەهەڵەبجەوە پێگەیشت کەتیایدا جگەلەبەخێرهێنانی بۆشارەکە، هەواڵی هاتنی دوولەشکری عوسمانیشی پێدا کەلەسلێمانیەوە بۆهەڵەبجە بەڕێکەوتوون.[3] بەڵام هەروەك دواتر دەرکەوت لەبری ئەو دوو لەشکرەی کە بڕیاربوو مستەفابەگ لەسلێمانیەوە بیهێنێ نزیکەی(50) سوارەودوو ڕەشاشو شەستیرو کۆمەڵێك لەگەورە پیاوانی عەشایری (ئەحمەدوەندی چەلبی) لەگەڵ خۆیدا هێنابوو بۆ هەڵەبجە.[4]

بەوشێوەیە عەلی ئەکبەرخان لەسەرداوای مستەفابەگ بەخۆیو سوارەکانیەوە ڕوویان کردە هەڵەبجە. بەر لە گەیشتنیشیان بەناوشار هەریەك لەقایمقامی شار( ناوی قایمقامی نەهێناوە) وزیائەدین بەگی فەرماندەی هێزەکانی سنورو تاهیر بەگی کوڕی وەسمان پاشا کەئەوکات سەرۆکی شارەوانی هەڵەبجەبوو نزیکەی (6کم) لەهەڵەبجە دورکەوتبوونەوە بۆ پێشوازی کردن لەوان، لەنزیك شاریش لەگەڵ (مستەفابەگو سالارزەفەر)ی نوێنەری عەلی ئەکبەرخاندا یەکیان گرتو پاشان چوونە ناوشارەوە. عادیلەخانی ژنی وەسمان پاشاش ماڵی خۆیانی بۆ میوانداریو پێشوازیکردن لەوان ئامادەکرد، جگە لەوەش بۆ زیاتر ڕێزگرتن لەوان لەو ڕۆژەدا خانم قایمقامی هەڵەبجەو تەواوی دەسەڵاتدارانو گەورەپیاوانی شارەکەی بۆماڵی خۆیان بانگکردبوو. لەنزیك کاتی عەسری هەمان ڕۆژ (عەلی ئەکبەرخان) سەردانی هەریەکەلە قایمقامو مستەفابەگی کردو لەگفتوگۆیەکی چڕوپڕدا باسیان لەوهاوکاریویارمەتیانە کرد کەدەسەڵاتدارانی عوسمانی لەناوچەکەدا دەتوانن پێشکەشی عەلی ئەکبەرخانی بکەن، بەڵام هەروەك عەلی ئەکبەرخان خۆی دەڵێت هەرلەسەرەتای داخل بوونی بەشاری هەڵەبجە لەبارودۆخی سەربازانی عوسمانی توانای عوسمانیەکان بۆ یارمەتیدانی ئەوان نائومێدبووە.

---

[1] ـ هەمان سەرچاوە, ل532.

[2] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل228.

[3] ـهەمان سەرچاوە, ل534 .

[4] ـ هەمان سەرچاوە, ل535 .

هەر ئەو ڕۆژانە (مستەفابەگ)كە تازە لەسلێمانی گەڕابووەوە بڕیاربوو مەحمود پاشای جاف بەتۆمەتی پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیزەكاندا بگرێتو ڕەوانەی موسڵی بكات هەروەك چۆن پێشتر بەهەمان تۆمەت (شێخ مەحمودو ئەحمەدبەگی كوڕی تۆفیق بەگ)یان گرتو ناردنیان بۆ موسڵ. بەڵام دواتر فەرمان لەسەرەوە هات كەبەشێوەیەكی ژیرانەو نەرمونیان مامەڵە لەگەڵ گەورەپیاوانی جافدا بكرێت. ڕاستیشت دەوێ ئەو ڕۆژانە عوسمانیەكان لەبارودۆخێكی خراپدا بوونو نەشیان دەویست بەگرتنی مەحمود پاشا هێندەی تر باودۆخەكە ئاڵۆزبكەن. بۆیە مستەفابەگ هەواڵی لێخۆشبوونی مەحمود پاشای گەیاندە قایمقامو داواشی لەعەلی ئەكبەرخان كرد كەئەو هەواڵە بگەیەنێتە خودی مەحمود پاشا خۆی.[1]

عەلی ئەكبەرخان دوای گەیشتنی بەهەڵەبجە دووبارە چەند نامەیەكی بە(حاجی موتاع)ی خزمەتكاری محەمەدتەقی بەگدا نارد بۆ هەردوو شێخی تەریقەتی نەقشبەندی(شێخ حوسامەدینو شێخ نەجمەدین)، جگەلەوەش داوای لەمستەفابەگ كرد كەوەك یەكەم هەنگاو بۆ ڕوویەڕووبوونەوەی ئینگلیزەكان بانگهێشتی هەردوو شێخی ناوبراو بكات، ئەویش بەخێرایی هەردووكیانی بانگهێشتكرد بۆ شاری هەڵەبجە، تابەهۆی ئەوپلەوپایە ئاینیو كۆمەلایەتیەی كەهەردوو شێخی ناوبراو لەناو عەشایەرەكانی هەردوو دیوی سنوری ئێرانی وعوسمانیدا لەناوچەكەدا هەیانە كاریگەری خۆیان بیخەنەگەڕ بۆهاندانی ئەوخەڵكەعەشایەرە بۆ ڕووبەڕوویوونەوەی ئینگلیزەكان.

ڕۆژی 25ی ڕەمەزان هەردووكیان گەیشتنە شاری هەڵەبجە، هەروەك پێشتر بەڵێنی دابوو بەعەلی ئەكبەرخان، شێخ حوسامەدین جارێكیتر ئامادەیی خۆی بۆ هەرجۆرە یارمەتیو هاوكارییەكی ئەوان نیشاندا، هەروەها بەڵێنیشیدا كەتەواوی گەورەپیاوانی هەورامانو جوانڕۆ هانبدات بۆ ڕووبەڕوویوونەوەی ئینگلیزەكان، بەڵام شێخ نەجمەدین هەرچەندە لەڕووخساردا ئامادەیی خۆی بۆیارمەتیدانی ئەوان دەربڕی، بەڵام لەناواخندا هەروەك عەلی ئەكبەرخان باسی دەكات وەك شێخ حوسامەدین نەبوو. دوای دووشەو هەردوو شێخ گەڕانەوە بۆهەورامان بەڵێنی ئەوەشیان دابوو كەدوای مانگی پیرۆزی ڕەمەزان بۆ هەمان مەبەست بگەڕێنەوە بۆ هەڵەبجە.

لەو ڕۆژنەدا هەواڵ گەیشتە هەڵەبجە، كەدوو فڕۆكەی ئینگلیز لەنزیك قەڵای شەمێران سوڕاونەتەوە، دواتر لەبریماڵی محەمەدتەقی بەگ، چەندبۆمبێكیان فڕێدابوویە ناوئاوایی سەید مەحمودی مەولەوی كەدۆستی ئینگلیزەكان خۆیان بوو لەئەنجامدا دووژنو پیاوێكو سێ منداڵو ژمارەیەك ئاژەڵی ئەو ئاواییەی كوشتبوو.[2]

لەم كاتەدا سوڵتانی عوسمانی، والی موسڵ (خەلیل پاشا)ی لابردو لەجێگای ئەو(عەلی ئیحسان پاشا)ی بەرپرسی ناوچەی قەفقازی لەشوێنی ئەودانا، عەلی ئیحسان پاشاش لەگەڵ دەس بەكاربوونیدا (عاشیربەگ)ی كردە فەرماندەی هێزەكانی عوسمانی لەكەركوك، عاشیربەگیش دەستبەجێ نامەیەكی بۆ(مستەفابەگ)ی فەرماندەی هێزەكانی عوسمانی لەهەڵەبجە ناردو داوای لێكرد كە هێزەكەی بگەڕێنێتەوە بۆسلێمانیو لەوێشەوە ئەو هێزە ڕەوانەی (ئاڵتون كۆپری) بكات.[3]

مستەفابەگ بەرلەوەی بكەوێتە ڕێ بۆ سلێمانی چاوی كەوت بەعەلی ئەكبەرخانو هەواڵی ڕۆیشتنەكەی خۆیی پێدا، پەنجا لیرەشی دا بەعەلی ئەكبەرخان بۆئەوەی دابەشی بكات بەسەرسوارەكانیدا، هەروەها ئەوەشی پێوت كەلەلایەن دەسەڵاتدارانی سەروخۆیەوە ئاگاداركراوەتەوە هەتا لەهەڵەبجە دابن میوانی دەوڵەتی عوسمانین.[4] سنجابی دەڵێ :"لە ڕۆژی چوونە ناوەوەی ئێمە بۆ هەڵەبجە تا ئەم بەرواره (دوای 18 ڕۆژ) لەگەڵ ئەو(60) سوارەدا لەماڵی عادیلەخانم میوان بووین. خانم چ خۆیو كوڕەكەی تاهیر بەگ، چ كەسانی ترو خزمەتكارەكانی ئەوان بەوپەڕی میهرەبانیو سۆزو ڕەوشت

---

[1] ـ هەمان سەرچاوە, ل534ـ535 .

[2] ـ هەمان سەرچاوە, ل537,538 .

[3] ـ هەمان سەرچاوە, ل538 .

[4] ـ هەمان سەرچاوە, ل540 .

جوانیو ئەدەبەوە ڕەفتاریان لەگەڵ دەکردینو خزمەتیان دەکردین. بۆ ڕێزگرتن لە ئێمە هەمیشە کۆمەڵێك لە بەگزادەکانی جافی مورادیو مەحمود پاشا ئامادەییان هەبووە، هەموو ڕۆژێك بۆ نانی بەیانی (20) دەستە تاقم (کۆمەڵە)و بۆ نانی ئێوارە (20) دەستەو تاقم خۆراکی جۆراوجۆریان لێدەناو ئامادە دەکرد. لەبەرئەوەی عادیلەخانم لەوەکیل ئەلمەلیك سەنەندەجییەبوو، ڕێکوپێکیو ماڵو سفرەو خوانی ئەو وەکو گەورەکانی ئێران وابوو، هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ عوسمانییەکاندا نەبوو. دوای چەند رۆژێك لەمانەوەمان لەماڵ خانم، بۆئەوەی لەوە زیاترنەبینە ئەرك بەسەرئەوانەوە، دوای ئەوەی کەمستەفابەگی فەرماندەی هێزەکانی عوسمانی هەموو ئەرکو مەسرەفێکی خۆمانو سوارەکانمانی خستەئەستۆی حکومەت، بەحوکمی ئەوەی تاهیر بەگ سەرۆکی شارەوانی بوو داوام لێکرد کەخانوویەکمان بۆبەکرێ بگرێت، بەڵام کاتێك خانم بەوەی زانی سوێندی خوارد کەهەتا ئێمە لەهەڵەبجەدابین میوانی ئەوین تەنانەت ئەگەرسالێك یان زیاتریش بخایەنێ، سەرئەنجام بەوە ڕازیبوو کەخودی منو سالارزەفەرو سالارموقتەدیرو ئەمیری عەشایەرو لاهوتی خانوئیسماعیل خان لەگەڵ دووسێ کەسی تر لەماڵ خانم خۆیان بمێنینەوەو، بۆ سوارەکانی تر خانوویەکی سەربەخۆ بگرین. ماوەی مانەوەی ئێمە لەو ماڵەدا (18) ڕۆژ درێژەی کێشا. میوانداریو خزمەتکردنیان ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر باشتر دەبوو. لە ڕاستیدا هەرچەند لە بەڕێزیو گەورەییو میوانداری ئەو شێرە ژنە بنووسرێ بەس نییەو کۆتایی نایەت".[1]

عەلی ئەکبەرخان دەڵێت:"بەرلەدەرچونمان لەهەڵەبجە مەحمود پاشای جاف دیدارو چاوپێکەوتنی هاوڕازانەی لەگەڵ مندا کرد. ڕۆژێکیان نزیك بەکاتی عەسر کاتێك دەڕۆشتم بۆماڵێك کەلەخانووی حامید بەگدا بوو، مەحمود پاشا لەچۆڵاییەکدا پێ ی گوتم عەلی ئەکبەرخان حەیفە ئێوە تەمەنی خۆتان لەکیس دەدەنوشوێنی ئەم عوسمانییە بێ سیفەتانە دەکەونولایەنگرییان دەکەن، عوسمانیەکان زیاتر لەئینگلیزەکان دوژمنی ئێرانوئێرانیەکانن. دواترئەوەی پێ ڕاگەیاندم کەپەیوەندی لەگەڵ ئینگلیزەکان باشەو، پێ ی گوتم ئەگەربەڵێنی پێ بدەم کەواز لەعوسمانیەکان بهێنم ئەودەتوانێت پەیوەندی ئێمە لەگەڵ ئینگلیزەکاندا چاك بکاتوهۆکاری ڕزگاربوونی (سەردارناصر)ی سەرۆك عەشیرەتی ئێمە (سنجابی) کەلەلایەن ئینگلیزەکانەوە گیرابوو بەدەست بهێنێ".[2]

عەلی ئەکبەرخان باس لەوە دەکات لەگەڵ بیستنی هەواڵی ڕۆیشتنی ئەوان (عەلی ئەکبەرخانو سوارەکانی هاوڕێ ی)و زیائەدین بەگ لە هەڵەبجەوە بۆ سلێمانیو پێشڕەوی هێزەکانی ئینگلیزو تێکشکانە یەك لەدوای یەکەکانی عوسمانیەکان لەبەرەکانی جەنگدا بە ئاشکرا خەمو خەفەت بە ڕووخساری تاهیر بەگو خەڵکانی دەوروبەری ئەوەوە دیاربوو، چونکە تاهیر بەگ بەدرێژایی سالآنی جەنگی یەکەمی جیهانی خزمەتێکی گەورەی دەوڵەتی عوسمانی کردبوو. بەپێچەوانەوە مەحمود پاشای جاف زۆر خۆشحاڵ بووە، ئەو خۆشحاڵیەشی بەئاشکرا لە ڕوخسارییەوە بەدی دەکراوە، چەندین ساڵ بوو کەعوسمانیەکان ئەویان بەتۆمەتی هەبوونی پەیوەندی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا لە سەرۆکایەتی عەشیرەتی گەورەی جاف دورخستبووەوە.[3]

لەڕاستیدا بارودۆخی عوسمانیەکان بەتایبەتی لەم ناوچەیەدا زۆرئاڵۆزو خراپ بوویوو. لەلایەك بەهۆی پێشڕەوی خێرای هێزەکانی بەریتانی لەبەرەکانی فەلەستینو حیجاز، لەلایەکی ترەوە بەهۆی بێزاربوونی لەڕادەبەدەری کوردەکان

---

[1] ـد. کریم سنجابی: ایل سنجابی ومجاهدت ملی ایران, چاپ اول, تهران, 1380, ل542,543 .

[2] ـ هەمان سەرچاوە, ل544 .

[3] ـ هەمان سەرچاوە, ل543 .

لەدەسەڵاتی تورك وئەو هاوكاریو یارمەتیەی كە كوردەكان پێشكەشی ئینگلیزەكانیان دەكرد، بەوهۆیەشەوە توركەكان لەبەرەی كەركوكدا بەتەواوی لاوازبوویوون.[1]

تا ئەوەی كە هێزەكانی ئینگلیز دوای گەیشتنیان بەكفریو دووزخورماتوو لە مانگی نیسانی 1918و لە ڕێكەوتی 7ی مایسی 1918 بەسەركردایەتی جەنەراڵ مارشاڵ شاری كەركوكیان داگیركرد، ئەگەرچی ئەم پرۆسەی داگیركارییە لەچەند رۆژێك زیاتری نەخایاند دواتر ئینگلیزەكان لەبەر چەند هۆكارێك لێیكشانەوە، دەسەڵاتی عوسمانی گەڕایەوە بۆشارەكە، بەڵام دووبارە هێزەكانی ئینگلیزلە 1918/10/25 شاری كەركوكیان كۆنترۆڵ كردەوە لە 31ی هەمان مانگدا ئاگربەستی (مۆدرۆس) مۆركراو جەنگی یەكەمی جیهانی ڕاوەستا،لەوكاتەدا عەلی ئیحسان شاپا بەتەلگراف فەرمانیدا بە(عەلی ڕەزابەگ)ی موتەسەڕیفی لیوای سلێمانی كەئیدارەی شارەكە بداتە دەست شێخ مەحمود، جگەلەوەش نازناوی(نەقیب)یش بەشێخ مەحمود بەخشراو، لەسلێمانیدا تەنها ئەو فەوجە سەربازە توركییە مایەوە كە(ساڵح بەگی تابوور ئاغاسی) فەرماندەی بوو.

بەوشێوەیە شێخ مەحمود بوویە موتەسەڕیفی سلێمانیو بەناوی حكومەتی عوسمانیەوە ئیدارەی شارەكەی گرتەدەست. پیاوانی توركوعەلی ڕەزابەگی موتەسەڕیفی عوسمانی شاری سلێمانی بەجێهێشتو ڕوویان كردە موسڵ. شێخ مەحمود دووبارە[2] ئەم بارودۆخە تازەیەی سلێمانی بەهەل زانی و نامەیەكی بە(عیزەت تۆپچیو فایەق تاپۆ) دا نارد بۆئینگلیزەكان سەرلەنوێ داوای لێكردن كەبەرەو سلێمانی بێن بەرامبەر بەهەندێك پەیمانو بەڵێن كەوەك مەرج بۆ ئینگلیزەكانی دانابوو. تاگەیشتنی ئەم نامەیە هێزەكانی ئینگلیز لەخۆیان ڕانەدەبینی هێندە بەئاسانی بچنە نێو سلێمانیەوە. بۆیە ئەونامەیە زۆر دڵخۆشی كردن بەڵێنیان بەشێخ مەحمەددا كەبەرەو سلێمانی برۆن.[3]

بەفەرمانی حكوومەتی ئینگلیز پاش داگیركردنی شاری سلێمانی لەلایەن هێزەكانی ئینگلیزەوە میجەرنۆئیل رۆشت بۆلای مەحمود پاشای جاف، كەئەوكات لەناوچەی زەڵمی هەورامان بووە. كاتێك ئەم هەواڵەیان بەمەحمود پاشا ڕاگەیاند كەوا مێجەرنۆئیل لەگەڵ چەند ئەفسەرێكی پایە بڵندی ئینگلیزدا هاتووە، مەحمود پاشا نەرۆشت بەپیریانەوە، بەڵكو بەرگی پاشایەتی عوسمانی لەبەركرد، هەرچی مەدالیایەك كەپێی بەخشرابوو كردی بەجلوبەرگی خۆیداو لەناو ڕەشماڵەكەیدا چاوەڕێیانی كرد، كاتێك مێجەرنۆئیل گەیشتە لای مەحمود پاشاو بەو جلوبەرگو مەدالیایەوە مەحمود پاشای جافی بینی كە پلەی ئەو لە پلەی خۆی بەرزترە، لەبەردەمیدا ڕاوەستاو دانەنیشت تا ئەوكاتەی مەحمود پاشا فەرمووی لێدەكات.[4] پاش بەخێرهێنانی، میجەرنۆئیل دەڵێت: ئینگلیز دەیەوێ خزمەتی ناوچەی كوردستان بكاتو یارمەتی میللەتی كورد بداو، مافی بداتیو لەدەست زوڵمو زۆری عوسمانی ڕزگاریان بكات. بۆئەم مەبەستەش چاوەڕوانی پیاوێكی وەكو ئێوەیە، كە سەرۆك هۆزی جافی، هاوكاریمان لەگەڵدا بكەیت، مەحمود پاشا لەوەڵامدا دەڵێ لەبەر سێ هۆكار من ناتوانم هاوكاریتان لەگەڵدا بكەم:

---

[1] ـ هەمان سەرچاوە, ل538 .

[2] ـ جاری یەكەم كەئینگلیزەكان هاتنە كەركوك شێخ مەحمود دوونامەی بۆ ناردن، تیایدا داوای لێكردبوون بێن بۆ سلێمانی، بەڵام بەهۆی پاشەكشەی ئینگلیزەكان یەكێك لەونامانە كەوتە دەست توركەكان, بۆیە ئەوانیش شێخیان گرتو ڕەوانەی موسڵیان كردو فەرمانی لەسێدارە دانی بۆدەركرا، بەڵام بەهۆی گۆڕانی خەلیل پاشای والی موسڵ بەعەلی ئیحسان پاشا ئەوفەرمانە جێ بەجێ نەكرا .( ئاكۆ شوانی: سەرچاوەی پێشوو, ل90)

[3] ـ ئاكۆ عەبدولكەریم شوانی: سەرچاوەی پێشوو, ل89ـ90 .

[4] ـد. حەسەن جاف: نەخشی هۆزی جاف لەسای چەند سەرۆكێكیەوە لەمێژووی كورددا , گۆڤاری كۆڕی زانیاری عێراق , ب22ـ21, بەغدا, 1990 , ل60، كەریم بەگی فەتاح بەك: سەرچاوەی پێشوو, ل89.

یەکەم: یەکەم ئەوەیە کەمن گومانم هەیە لەڕاستگۆیی ئێوە، ئەگەر ئێوە بەڕاستی بتانەوێ خزمەتی میللەتی کورد بکەنو مەبەستان ڕاستی بێ، هەزاری وەکو منتان لەگەڵ نەبێ، هەرئێوە سەردەکەون.

دووەم: دووەم ئەوەیە کەمن موسوڵمانوبیروباوەڕی ئاینیم یەکجار بەهێزە،[1] ئەم بیروباوەڕەشم ڕێگەی ئەوەم نادات هاوکاریتان لەگەڵدا بکەم.[2]

سێیەم: من پیربوومو توانای هەڵسوکەوتم نەماوە بۆ کاری وەهادەست نادەم.

ئینگلیزەکان کاتێك هەلۆیستی مەحمود پاشایان بۆ ڕوونبوویەوە کەوتنە لاوازکردنی دەسەلاتیوهۆزی جاف. مەحمود پاشاش ئەوەندە پیربوویوو نەیدەتوانی بەربەرەکانی ئینگلیزەکان بکات.[3]

لەڕاستیدا هەروەك (کەریم بەگی فەتاح بەگ)یش ئاماژەی پێداوە هۆزی جافیش وەك هەموو هۆزەکانی تری کورد گرفتاری فرتوفێڵی ئینگلیزەکان بوون، ئینگلیزەکانیش وەك دەوڵەتەی عوسمانی هەوڵیانداوە جافەکان بۆبەرژەوەندی خۆیان بەکاربهێنن، کوردەکان هاوکارییان لەگەڵدا بکەن، لەم ڕووەوە تەماحیان خستووەتە بەردەم سەرۆك هۆزەکانی جاف تاهاوکارییان لەگەڵدا بکەن.[4] چونکە جافەکان هەروەك ئیدمۆندز ئاماژەی پێداوە لەپلەی عەشیرەتێکی کورددا، پتر لەعەشیرەتەکانی دیکە خزمەتوفیداکارییان کردووە.[5]

ئینگلیزەکان دەمێك بوو مێجەرسۆنیان بۆئەوە گۆش کردبوو کەفرمانێکی تایبەتی پێبسپێرن. ئەو گەشتەی لەساڵی 1909 داکردبوی بۆ ناوچەی سلێمانیو بۆناوجافەکانی هەڵەبجە گەشتێکی ئاساییو خۆڕایی نەبووە، بەڵکو ڕاسپێردراوی دەزگا جاسوسیەکانی ئەوسەردەمی ئینگلیزبووە لە هیندستاندا، لەشەریکەی ئەفریقیو شەریکەی ئینگلۆ– ئێرانیو سەرپەرشتی کردنی ئەوئینگلیزانەی کردووە کەنێردران بۆ ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست. سۆن هەرلەخۆیەوە ئەو ڕێگەیەی نەگرتووەتە بەرو بەخۆڕایی فێری زمانی فارسیو کوردی نەبووە بەڵکو حسابی دوا ڕۆژی بۆکراوە.

سۆن لەگەشتەکەیدا لەساڵی 1909دا بەناوی بازرگانیەوە ڕۆیشتە هەڵەبجەو ماوەیەك لەناو جافەکاندا مایەوەو پەیوەنییەکی گەرمی پەیداکرد لەگەڵ عادیلەخانموکوڕەکانیدا، عادیلەخان ئەگەر چی بەڕواڵەت هەندێ جار دۆستایەتی خۆی پیشان دابوو بەرامبەر بەنەوەی کاك ئەحمەدی شێخو کەشێخ مەحمود بۆجاری دووەم لەساڵی 1922 دا کرایەوە بەحوکمدارو خانم بۆ پیرۆزبایی کردن لەشێخ مەحمود خانم بەخۆیو دەستەو دایەرەیەوە چووە سلێمانی وشێخ مەحمود پێشوازی لێکردو حامید بەگی جافیش لەسەرەتادا بۆماوەیەك لەگەڵ شێخ مەحموددا بووەو سەردەمێکیش ئینگلیزەکان ڕاویان نابوو بۆ دەرەوەی هەڵەبجەو بەدوایدا دەگەڕان، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی وەکو یاساو سرووشتی هەموو عەشایەرێك وەنەبووبێ شێخیان خۆش ویستبێت وەکو لەباسی بنەماڵەی شێخانو جافەکاندا باسمان کرد، بێگومان مێجەرسۆنی زیرەکو وریا ئاگاداری ناکۆکی نێوان بنەماڵەی شێخانوجافەکان بووە، زانیویەتی کەشێخان لەکارەساتی موسڵدا لەمەحمود پاشای سەرۆکی لقی (ئیتیحادو تەرەقی) دلگیربوونو ئەوقینە بەخۆڕایی لەدڵیان دەرنەچووە، بۆیە

---

[1] ـ مەلا عەبدوڵای زێوەر دەڵێ: "مەحمود پاشا زاتێکی بەئیعتیبار, بەتاعەت, بەعیبادەت, بەئیحسان, بەئینعام, بەعەدالەت, بەحوکم بوو. عادەتی وابوو کەنوێژی بەیانی ئەکرد لەسەر بەرماڵ هەڵنەدەستا قورئانودەلایلی دەخوێن هەتا هەتاوگەرم دەبوو, ئەوسا سوننەتی ئیشراقی ئەکرد. لەپاش ویردو سوننەت کردنو قورئان خوێندن تەشریفی ئەهاتە مەجلیس". (گەنجینەی مەردان, ل70)

[2] ـ حەسەن جاف: نەخشی هۆزی جاف , ل60، کەریم بەگی فەتاح بەگ: سەرچاوەی پێشوو , ل90.

[3] ـ حەسەن جاف: نەخشی هۆزی جاف , ل61، کەریم بەگی فەتاح بەگ: سەرچاوەی پێشوو, ل90.

[4] ـ کەریم بەگی فەتاح بەگ: سەرچاوەی پێشوو, ل89.

[5] ـ سەرچاوەی پێشوو , ل182.

مێجەرسۆن ئەو ناکۆکییەی قۆستەوەو توانیویەتی لەدواییدا کەکرا بەحاکمی سیاسی لەسلێمانی زۆرلێزانانە ئەوناکۆکییە کۆنە بۆ بەرژەوەندی خۆیو سیاسەتی حکومەتەکەی بەکاربهێنێت.[1] هەرئەمەش وای کرد هەروەك نوسەرانی کتێبی (کوردو کوردستان) ئاماژەی بۆ ئەوە دەکەن کە ئینگلیزەکان بەئاشکرا کاریان بۆ دابڕینی هۆزی جافی ئازاو گەورە دەکرد لە دەسەڵاتی شێخ مەحمود، بەونیازەی لەنزیکەوەو بەجیا مامەڵەی تایبەتی لەگەڵدا بکەن، بۆئەم مەبەستەش کەسێکیان وەك یاریدەدەری ئەفسەری سیاسی لەهەڵەبجەدا قوت کردەوە، دابڕینو هەڵاوێرانی جاف جەربەزەیەکی کاریگەریووکە ئاراستەی دەسەڵاتی شیخ مەحمود کرا.[2]

تەقەلای ئینگلیز بۆکرندنی هەڵەبجە بەبنکەیەکی هاوتا بەرانبەر بەسلێمانیو پەیداکردنی ناکۆکیو دژایەتی لەنێوانیاندا کارێکی زۆرگران نەبوو وکۆششێکی فراوانی نەدەویست، گەلێ هۆی خۆیەتیویابەتی ڕێگای بۆئەوە خۆش دەکرد.[3]

بۆیە ئینگلیزەکان یەکێك لەو شوێنانەی کە لەو ڕۆژانەدا دەیانویست بەرامبەر بە خواستەکانی شێخ مەحمود بیوەستێنن شاری هەڵەبجە بوو، لەو ڕۆژانە بەدواوە ئیتر کاربەدەستان زیاتر بەشانو باهوی هەڵەبجەدا هەڵیان دەداو بەناڕێکیو ناشیرینی باسی شاری سلێمانیان دەکرد، تەنانەت(مستەر ڕیچ) لەدەورەی باباناو (مێجەرسۆن)یش لەدویدا کەچوونە سلێمانی لەجوانی ئەوشارە دواون وئومێدیان بەو شارە بووە بەرامبەر بەتورکەکان ڕاستیان بکەنەوەو دواتریش ئاواتەکەیان بهێننەدی، بەڵام نائومێد بوون، د.عیزەدین مستەفا لەم بارەیەوە دەڵێت: "سۆن ـ لەشێخانی سلێمانی نائومێدبووە لەبەرئەوە تەنانەت خانوو گوێ سەبانەی سلێمانیشی لاناڕێك بووە بەهیوای ئەوەبووە کەهەڵەبجە ئاواتی بهێنێتەدی بۆیە باس لەجوانیوڕێكوپێکی شاری هەڵەبجە زیاتردەکات".[4]

پاش ئەوەی مێجەرنوێل لەڕێکەوتی 16/تشرینی دووەمی/1918دا گەیشتە شاری سلێمانی وەك نێردراوێکی حکومەتی بەریتانیا، بەخۆیوکۆمەڵێك بڕیاروڕاسپاردەی حکومەتەکەیەوە هاتبوو،ئەوەبوو بۆڕۆژی دواتر لەبەردەرکی سەرای شاری سلێمانیداو، لەبەردەم ئاپۆڕایەکی زۆری خەڵکی شاری سلێمانیو کوردستانی ئێران وتارێکی بەزمانی فارسی پێشکەش کردو، تێیدا شێخ مەحمودی وەك (حوکمدار) بەخەڵك ناساند کەلەلایەن حکومەتی بەریتانیاوە کراوە بەحوکمداری ئەم ناوچەیەو خودی(مێجەرنێل)یش بوو بوراوێژکاری سیاسی شێخ مەحمودو (مێجەردانلیس)یش وەك ڕاوێژکاری سەربازی دانرا.[5]

حوکمڕانی یەکەمی شێخ مەحمود تاحوزەیران 1919بەردەوام بوو، ئەوەبوو شەڕەکەی دەربەندی بازیان لە17/حوزەیرانی/1919دا کۆتایی بەوفەرمانڕەوایەتییە هێناوشێخ بەبریندار دەستگیرکراولەلایەن دادگایەکی ئینگلیزەوە لەبەغداد فەرمانی خنکاندنی بەسەردا سەپێنراودوایی کردیان بەبەندی هەمیشەییو دواجار گۆڕا بەفەرمانی دوورخستنەوەی بۆ هیندستان.[6] بەم شێوەیە کۆتایی بەیەکەمین حوکمدارێتی شێخ مەحمود هات لەسلێمانی، کەحەوت مانگویەك ڕۆژی خایاند.[7]

---

[1] ـ ڕەسول هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب1, ل454ـ455.

[2] ـ کۆمەڵێك لەپسپۆڕانوئەفسەرانی سیاسی ئینگلیز: کوردوکوردستان , ل64ـ65.

[3] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل232.

[4] ـ هەمان سەرچاوە, ل232.

[5] ـ ئاکۆعەبدولکەریم شوانی: سەرچاوەی پێشوو, ل96.

[6] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل229.

[7] ـ ئاکۆعەبدولکەریم شوانی: سەرچاوەی پێشوو, ل118.

یەکێك لەو خزمەتگوزارییە گەورانەی کە (عادیلە خانم) پێشکەشی هێزەکانی داگیرکەری بەریتانیای کردبوو، بەشدارییەکی کاریگەری کرد لە سەرکەوتنی کاری هەڵاتنی ئەفسەری سیاسی ناوچەی هەڵەبجە ـ مولازمی فرۆکەوانی (ج.م. لین) کە یەکەم ئەفسەری سیاسی ئینگلیز بوو لە هەڵەبجەدا لە ئازاری/1919 دامەزراو لە کانوونی دووەمی 1921 گوازرایەوە بۆ خانەقین. لە کاتی هێرشهێنانی شۆڕشگێڕەکان بۆ ئەو شارە لە 26/مایسی/1919دا.خانم ڕۆڵێکی دڵگیری لەو کارەدا بینی کە (لین) خۆشی بەو شێوەیە باسی کردووە.[1] لەڕێکەوتی28/حوزەیرانی هەمان ساڵیشدا هەڵەبجە داگیرکرایەوەو ئەو سەربازە هیندیانەی کە لەوێ دەستبەسەر بوون ئازادکران، هەندێك لە هێزەکانی ئینگلیز بە نیازی هێورکردنەوەی خێڵەکان نێردران بۆ چەمو دۆڵەکانی دەوروبەری شاری هەڵەبجە.[2]

ئیدمۆندز سەبارەت بە عایلەخانم دەڵێت: "شاژنە تاج لەسەرنەنراوی تەختی شارەزوور بوو، کە دواتر بە چاکەی خزمەتەکانی لەلایەن جێگری فەرمانڕەوای هیندستانەوە، پلەی بەرزی (خان بەهادر)ی پێ بەخشرا".[3]

لە دوا ڕۆژەکانی مانگی حوزەیرانی 1919دا، ژەنەراڵ فرێزەر بڕیاریدا خۆی بڕوات بۆ هەڵەبجەو سوپاسی فەرماندەی گشتی بە (خانم) بگەیەنێ. لەو سەفەرەی فرێزەردا گرینهاوس و هەردوو کوڕەکەی خانم (ئەحمەد بەگو عیزەت بەگ) لەگەڵدا بوو، کە هەریەکەیان جلوبەرگێکی بەنرخی خاوێنو مێزەری پانو زلی تایبەت بە بەگزادەی جافیان لەسەردابوو، کە بۆ پێشوازی کردن لە ژەنەراڵو گەیاندنی پەیامی ئەمەکناسی (خانم) ڕۆشتبوونە سلێمانی، لەگەڵ جەنەراڵ سواری ئۆتۆمبیل بوونو بەرەو هەڵەبجە گەڕانەوە.

ئیدمۆندز لە درێژەی ئەم گێڕانەوەیەدا باس لەوە دەکا کە چۆن لە ڕێگادا ئۆتۆمبیلەکەیان دەچەقێت لە قوڕداو جەنەراڵ دادەبەزێت لە دواوە پاڵ بە ئۆتۆمبیلەکەوە دەنێت، جەنەراڵ دەمو چاوو لاشەی قوڕاوی دەبێت، بەگزادەکانیش نەك هاوکاری ناکەن، بەڵکو لە دوورەوە تەماشای دەکەن، بۆیە جەنەراڵ داوا لە گرینهاوس دەکات کە زۆر بەتوندی بە ناوی ئەوەوە ڕەخنە لە بەگزادەکان بگرێتو ناڕەزایی ئەویان لە بەرامبەر ئەو کارەیاندا پێبگەیەنێ، ئەوەشیان پێ بڵێت کە ئەگەر دەیانەوێت لەگەڵ بەریتانیادا کار بکەن، دەبێ فێربنو زۆر بە جوانی بە کردەوە شان بدەنە بەر کار. یەکێك لە بەگزادەکان (عیزەت بەگ ـ نووسەر)، کە لەوی تریان گەورەتر بوو بە شێنەیی و بەبێ ترس وەڵامی جەنەراڵ دەداتەوەو دەڵێت: " قسەی جەنەراڵ دروستە، بەڵام بەو بڵێ سەیری جلوبەرگەکانی[4] ئێمە بکات، ئەم کەوڵە (300) ڕوپیەی هەڵگرتووە، عەباو مێزەرەکەش هیچ، لە کاتێکدا گشت جلوبەرگەکانی ئەو (بە دەست ئاماژەی بە جلوبەرگەکانی جەنەراڵ کرد) (20) ڕوپیە ناهێنێ".[5]

پێشتر باسمان لەوەکرد کەمێجەرسۆن ڕۆژێك بەرلەگرتنی شاری سلێمانی لەلایەن شێخ مەحمودەوە بەبیانوی گەیشتنی (لێنیت)ی ژنی بەشاری بەصرەو ڕۆیشتن بەدوایدا ئەو شارەی بەجێهێشت، دوای داگیرکردنەوەی شاری سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە بەهۆی پەیوەندییە مێژووییەکەی سۆن کەلەگەڵ عادیلەخانمو کوڕەکانیدا هەیبووە، سۆن لەگەڵ (لێنیت)ی خێزانیدا سەردانی هەڵەبجەو ماڵی (خانم)یان کردووە پێدەچێت ژنەکەی سۆن ماوەیەکیش لەماڵی خانمدا مابێتەوە،

[1] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل235.
[2] ـ کۆمەڵێك لەپسپۆڕانوئەفسەرانی سیاسی ئینگلیز: سەرچاوەی پێشوو, ل69ـ70.
[3] ـ ئیدمۆندز:سەرچاوەی پێشوو, ل81.
[4] ـ بەگزادەکانی جاف کەوای تاقەی گوڵ پێچوو کوجەراتوشیعریو شیرداغیان لەبەردەکردو چەفتەی مەلیکی سورمەی گوڵنکەدارو مشکی مۆریان دەبەست. (ئەکرەمی ساڵحی ڕەشە: شاری سلێمانی ,ب2, ل483)
[5] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو, ل81ـ82. احمدخواجە افندی: سەرچاوەی پێشوو, ل111ـ112.

بەهۆیەشەوە پەیوەندیەکی توندوتۆڵ لەنێوان (خانمو لێنیت)دا پەیدابووە، ڕادەی توندوتۆلی ئەو پەیوەندییەش لەئاڵوگۆڕی ئەونامانەدا بەدیار دەکەوێت کەلەنێوان هەردولادا ئاڵوگۆڕکراوە لەپاش گەڕانەوەی (لێنیت) بۆ وڵاتەکەی، کەبەدلخەوە ئێمە تەنها یەکێك لەونامانەمان لەبەردەستدایە کەخانم دوای گەیشتنی نامەیەکی (لێنیت) کە بۆ ئەوی ناردووە، ئەمیش لە ڕیگەی کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەلاتییەوە نامەیەکی ناردووە بۆ لێنیت کەتیایدا دەڵێت:

"هاورێی ئازیزو خۆشەویست، تۆ ڕۆیشتیتو دڵی ئێمەت شکاند، تەنها خودا دەزانێ چەند دڵم خەمباربوو بەڕۆیشتنی تۆی بەڕێز، لەبەرئەوەی نازانم چەند دوورکەوتویتەوە، کاتێك نامەکەت لەبۆمبایەوە گەیشت، زۆردڵخۆش بووم، لەوانەیە تۆیش دڵخۆش بوویت لەبەرئەوەی ئەم ڕۆژگارەت دروستکرد، زۆربەمیهرەبانانە پرسیاری منت کردبوو، خۆشبەختانە هیچ خەمێك نییە جگە لەخەمی دووری تۆ، ئومێدەوارم بەتەندروستییەکی باشو بەخۆشییەوە بگەڕێیتەوە بۆ وڵاتەکەت، هاورێکانت ببینەوە سوپاسگوزارییان بکە، انشاء الله، خێرا بگەڕێوە بۆئەوەی جارێکی تر تۆ ببینمەوە، ئەحواڵت ئەپرسم وەچاوەڕوانی بیستنی شتێکی تۆی ئازیزم".

خێزانی عوسمان پاشا،26/ڕەمەزانی/1339ك[1]

ئەو نامەیە جگە لەوەی بەزمانی فارسی نوسراوە، واژووی ( عادیلەخانم)ی لەسەرە، تەنانەت مۆریشی لەسەر کراوە کەلەمۆرەکە نوسراوە (عادلە خان).

لە ساڵی 1921دا کە مەحمود پاشای جاف مرد، هەروەك پێشر ئاماژەمان بۆ کرد، عەلی بەگی کوڕی بوو بە سەرۆکی عەشیرەتی جاف، بەڵام جێگری حاکمی سیاسی (لیز ـ نووسەر)، ئەو پلەیەی لە عەلی بەگ وەرگرتەوەو داویەتی بە (کەریم بەگی فەتاح بەگ)ی برازای مەحمود پاشو عوسمان پاشا، ئەم کارەی حاکمی سیاسی هەڵەبجە نارەزایی عادیلەخانو بەگزادەکانی تری هەڵەبجەی لێکەوتەوە، ئەوان بەو گۆڕانکارییە نارازی بوون، چونکە دانی ئەو پلەیەیان بە ئەندامێکی بچووکی بنەماڵەکەیان بە دڵ نەبوو.[2]

ڕەنگە هەر ئەو نارەزاییەش وای کردبێ لەو سەفەرەی کە ئیدمۆندز پێی هەڵساوە لە هەڵەبجەوە بۆ کەلار، بەر لە گەیشتنی بۆ کەلار شەوەکەی لە (بانی خێڵان)[3] ماوەتەوە، ئەو شەوە نامەیەکی گلەییو پڕ لە ئاخو نالەی (کەریم بەگی فەتاح بەگ)ی بە دەست دەگات، لە نامەکەدا ئاماژە بەوە کرابوو کە لایەنگرانی (خانم) لەناو خەڵکدا دەنگۆی ئەوەیان بڵاوکردووەتەوە کە ئێوە (ئیدمۆندز) بۆ لادانی من دێنە ئێرە. ئەو ڕوداوەش کاریگەرییەکی خراپی لەسەر باری هێمنایەتیو بارودۆخی گشتی عەشیرەتی جاف دانابوو، ئامادەنەبوون باج بدەن.[4]

ژمارەیەکی زۆریش لە جافەکان هەرچەندە لە دەرەوەی ناوچەی سلێمانی بوونو لە خاکی کەرکوکدا تاوڵیان هەڵدابوو، بەڵام جێگری حاکمی سیاسی (حاکمی هەڵەبجە ـ نووسەر) سەرپەرشتی دەکردن.[5]

لە ڕێکەوتی 1921/6/24دا حاکمی سیاسی[6] سلێمانی ڕۆیشت بۆ هەڵەبجە بۆ دروستکردنی ئەنجومەنێك بۆ قەزاکە، لە ڕێکەوتی 26/ حوزەیراندا یەکەم کۆبوونەوە گیرا. دروستکردنو دانانی ئەو ئەنجومەنانە لەسەر بڕیارو ڕاسپاردەی مەندوبی

---

1 ـ susan meiselas: kurdistan<p76

2 ـ هەمان سەرچاوە, ل201.

3 ـ دەکەوێتە باشوری شاری دەربەندیخان , بەدووری چەند کیلۆمەترێك.

4 ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو, ل203.

5 ـ هەمان سەرچاوە, ل202.

6 ـ دوای ئەوەی مێجەرسۆن لە5/مارت/ 1921 گەڕایەوە بۆ لەندەن, گۆڵد سمث جێگای گرتەوەو بوو بەحاکمی سیاسی سلێمانی. (ڕۆژنامەی پێشکەوتن , ژ46, 10/ مارت/1921)

سامی (سێرپرسی کۆکس)[1] بوو، ناوبراو بڕیاریدابوو لە هەر قەزایەك ئەنجومەنێك (میللی) دروست بکرێت، پاشان وردە وردە ئەو ئەنجومەنانە فراوان بکرێت تا ئەوەی ببێت بە حکومەتێکی میللی لە سایەی حکومەتی بەریتانیادا. کاتێك کە هەڵبژاردن کرا ئەمانەی خوارەوە هەڵبژێردران بە ئەندام:

1ـ عەلی بەگی مەحمود پاشا. (جاف)

2ـ کەریم بەگی فەتاح بەگ. (جاف)

3ـ ئەحمەد بەگی عوسمان پاشا. (جاف)

4ـ ئەفراسیاب بەگی ڕۆستەم سان. (هەورامی)

5ـ قادر بەگی جەعفەر سوڵتان. (هەورامی)

6ـ حامید بەگی مەجید بەگ. (جاف)

بڕیاردرا مانگانە ئەم ئەنجومەنە کۆببێتەوە، لە کاتی پێویستیشدا حاکمی قەزاکە دەتوانێت ئەندامانی ئەنجومەن کۆبکاتەوە بۆ گفتوگۆکردن سەبارەت بە هەر شتێك کە بێتە ئاراوە.[2]

لە کاتێکیشدا کە ئەنجومەنی شاری سلێمانی دروستکرا لە ساڵی 1921دا، ئەم ئەنجومەنە جگە لە (مێجەر گوڵدسمث) کە نوێنەری بەریتانیاو حاکمی سیاسی سلێمانی بوو، چەند نوێنەرێکی شاری سلێمانیو قەزاو ناحیەکانی سەر بەو شارە لەخۆ گرتبوو، لە هەڵەبجە بەگزادەکانی جافو (12) کەسی تر کۆبوونەوە، لەناو خۆیاندا (3) کەسیان دیاری کرد، دواتر ئەو سێ کەسەش (حامید بەگ)یان وەك نوێنەری هەڵەبجە لەو ئەنجومەنەدا دیاری کرد.[3]

لە مانگی دیسەمبەری 1921 لە ناوچەی خورماڵ دەستکرا بە کۆکردنەوەی باجو سەرانە، هەواڵ بە ئینگلیزەکان گەیشت مەحمود خانی دزڵی یەکێکە لەوانەی سەرپەرشتی باج کۆکردنەوەکە دەکات، فڕۆکەکانی ئینگلیز ئەوانیان ناچارکرد بگەڕێنەوە ناوچە شاخاوییەکان، دوای ئەوە مەحمود خان ڕۆیشتە (باخەکۆن) کە دوو میل[4] لە هەڵەبجەوە دوورە لەوێوە نامەی نارد بۆ ئەفسەری سیاسی ئینگلیز لە هەڵەبجە کە دەیەوێ دڵسۆزی خۆی بۆ حکومەت دەربڕێ، ئەم نامەیەی مەحمود خان پێچەوانەی ئەو نامانەی بوون کە بۆ هەریەکە لە سمکۆو مستەفا کەمالی ناردبوو، جگە لەوەش نامەیەکی بۆ سەرۆك عەشیرەتی هەمەوەند ناردبوو، لەو نامەدا گاڵتەی بەوانە کردبوو کە دان بە دەسەڵاتی ئینگلیزدا دەنێنو سەریان بۆ دادەنەوێنن.[5]

هەر لەو ڕۆژانەدا ئەحمەد بەگی ڕیشێن لە سلێمانی هەڵهات،[6] ئەحمەد بەگ یەکێك بوو لە گەورەکانی جاف بە تۆمەتی هاندانی بەگزادەکانی هەڵەبجە گیرابوو، لە سلێمانی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە خرابووە ژێر چاودێرییەوە،[7] ئەحمەد بەگی ڕیشێن کچی عادیلە خانی هێنابوو، لە هەمان کاتدا سکرتێری خانم خۆشی بوو.[8]

---

[1] ـ سێرپرسی کۆکس (1864ـ1937) سەرەتای ژیانی سەربازی لەهیندستان تەواو کردووەو دواتر ڕۆیشتووەتە بواری دبلۆماسیو زۆر پلەی سیاسی گرتووەتە ئەستۆ, یەکێکە لەدامەزرێنەرانی دەوڵەتی نوێی عێراق, یەکەم نوێنەری باڵای بەریتانیایە لە عێراق لەتشرینی یەکەمی 1920 هاتووەتە بەغدادو لە1/ مایسی/ 1923 دا گەڕایەوە بۆ لەندەنو هێنری دۆبس جێگەی گرتەوە.

[2] ـ ڕ (پێشکەوتن), ژ(62) , 1921/6/30، ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل159.

[3] ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل219.

[4] هەریەکە لە ئیدمۆنزو ڕەسوڵ هاوار وتوویانە دووری نێوان هەڵەبجەو باخەکۆن (دوو میل)ە، بەڵام من پێموایە زیاتر لە (پێنج میل) دەبێت.

[5] ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل221ـ222.

[6] ـ هەمان سەرچاوە, ل222.

[7] ـ ڕەفیق حیلمی: یادداشت, چ3, ل303.

سەبارەت بەوگرتنو خستنە ژێرچاودێرییەی ئەحمەد بەگ ئیدمۆنز ئەڵێ: "عادیلە خان بەوگرتنو ناردنەی ئەحمەد بەگی ڕیشێن بۆ سلێمانی لێمان دڵگیر بوو، پڕوپاگەندەی تورکەکان کاری تێ کردبوو خەریکی ئەوەبوون پەیوەندی لەگەڵدا بکەن".[1] ئەحمەد بەگی ڕیشێن لەکاتی خۆیدا بەدەست بەسەری نێررابوو بۆ سلێمانی، چونکە پەیوەندی بەمەحمود خانی دزڵییەوە هەبوو، لەبەر ئەوە لە سلێمانی خرایە ژێر چاودێرییەوە، بەڵام لە سلێمانی خۆی دەربازکرد، هەواڵ بەئینگلیزەکان گەیشت کە لە ئاوایی (ڕۆستەم بەگ) خۆیشاردووەتەوە کە لە پێدەشتی شاخی هەورامان دایە. بۆ ئەوەی ئەحمەدبەگی ڕیشێن خۆی نەگەیەنێتە لای مەحمود خانی دزڵی نزیکەی (70) سوارەی لیڤی بەسەرکردایەتی کاپتن (ڤیتزگیبون)[2] لەگەڵ ئەفسەرێکی خەڵکی ناوچەکە نێردران بۆهەڵەبجەو، لە ڕێکەتی 1922/1/11دا بە نهێنی بڕۆنە سەر (ئاوایی ڕۆستەم بەگ)، کاتێك ئەو هێزە لە 1922/1/12دا گەیشتنە ئەو گوندە بۆیان دەرکەوت کە دوو گوند بەو ناوەوەیە، کە یەکەمیان گیرا دەرکەوت کە ئەحمەد بەگ لەوەیاندا نەبوو، بەڵام لەوەدا هێزی لیڤیو مەیتەرەکەی ئەفسەری سیاسیش کوژرا.[3]

کاتێك کە مەحمود خانی دزڵی ئاگاداری ئەم شەڕە بوو یەکێك لە کوڕەکانی لەگەڵ (350) چەکداردا لە دزڵییەوە ناردە ئەم ناوچەیەو هەورامییەکانیش چوونە پاڵ ئەو، بەڵام بە هۆی بۆردومانی فڕۆکەوە هێزەکەی مەحمود خان کشایە دواوەو ئەحمەد بەگی ڕیشێن خۆی گەیاندە لای مەحمود خان.[4] (ئیدمۆندز)یش باسی لەو ڕووداوە کردووە کە لە ناوەڕاستی مانگی کانونی دووەمدا ڕوویداوەو کاپتن (ڤیتزگیبون)ی تیادا کوژراوە، لە ڕاپەڕینێکی نزیك خورماڵدا، کە تەنیا گەیشتنی هێزی ئاسمانی بووە پەلاماری هەڵەبجەی تێکشکاندووە.[5] لە ماوەی شەڕەکانی ئەو ڕۆژانەدا نزیکەی (7) فڕۆکەی ئینگلیز لە چیاکانی هەوراماندا کەوتوونەتە خوارەوە.[6]

لەو ڕۆژانەدا بارودۆخی ئەفسەری سیاسی هەڵەبجە بەرەو خراپی دەڕۆیشت، بە هۆی کۆمەڵە پلانێك کە لە نێو جافەکانی سەر بە عادیلەخانو لە نێو شاری هەڵەبجەدا دادەڕێژرا. خانم لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕایگەیاندبوو ئێستاش بەرامبەر بە حکومەت (سۆنو لین) وەفادارە، بەڵام لەگەڵ نوێنەری حکومەت پەیوەندییان باش نەبووە، ئەوەش لە ئەنجامی ئەو بارودۆخە نوێیەی کە هاتبووە ئاراوە هەروەك (ئیدمۆندز) باسی لێوە دەکات لەگەڵ خواستو ئاواتەکانی ئەودا نەدەگونجا.[7]

---

[1] ـ ڕسولڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل222.

[2] ـ هەمان سەرچاوە, ب2, ل223.

[3] ـ ئەحمەد خواجە بەشێوەیەکی دیکە ئەم ڕووداوی کوشتنەی کاپتن ڤیتزگیبون دەگێڕێتەوە, ئەو دەڵێ شێخ فەرەجی بانی بنۆك بەخزموعەشیرەتەکەیەوە ڕێگای نێوان سلێمانیو هەڵەبجەی بڕی, دواتر نامەیەکی نارد بۆ حاکمی سیاسی سلێمانی و داوای وەڵامدانەوەی ئەونامانەی کردووە کەپێشتر بۆیان ناردووە, هەروەها داوای سەربەخۆیی کوردستانو بەردانی شێخ مەحمودی کردووە لەنامەیەدا. حاکمی سیاسی (مێجەرسۆن) بەوەرگرتنی ئەو نامەیە زۆرتوڕە بوو, بۆیە هێزێکی لیڤی بەسەرکردایەتی ڤیتزگیبون نارد هەتاوەکو شێخ فەرەجو لایەنگرانی بگرنو بیان هێنن بۆ سلێمانی, ماوەی دە ڕۆژ شەڕگەرم بوو , نزیکەی دە فڕۆکەی ئینگلیز لەهەوراماندا کەوتنە خوارەوە , فەرماندەی هێزەکەش (ڤیتزگیبون) کوژراو لاشەکەی بەسەرشانی (حەمەی قالە پیرۆت) ی سەربازی لیڤی کوردەوە ڕزگارکراوە.( ئەحمەد خواجە: سەرچاوەی پێشوو, ب1, ل79ـ80). سەیر لەوەدایە ڕەسولڵ هاوار ئەم بابەتەی لەئەحمەد خواجە وەرگرتووە, کەچی لە(ل215, ب2) دا هەمان گێڕانەوەکەی ئەحمەد خواجە باس دەکات لەکوشتنەکەی (ڤیتز گیبۆن) دا , بەڵام لە( ل223, ب2) ی هەمان سەرچاوەدا دەڵێ لەڕووداوەکەی ئاوایی ڕۆستەم بەگدا کوژراوە.

[4] ـ ڕەسولڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو , ب2, ل222.

[5] ـ هەمان سەرچاوە, ل222.

[6] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو, ل160.

[7] ـ ڕەفیق حیلمی: سەرچاوەی پێشوو, ل303.

[8] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو, ل160.

لە مانگی نیسانی 1922 (ئیدمۆندز) کرا بە حاکمی سیاسی هەڵەبجە، کە ئەوە بە بڕوای ئەو پلەوپایەیەکی زۆر بچووک بووە بە بەراورد بەو پلەوپایانەی کە لە ماوەی پێنج ساڵی ڕابردوودا هەیبووە،[1] هەر بۆیە ئەم ئاڵوگۆڕە بووەتە جێگای سەرسوڕمانی ئیدمۆندز خۆی.

لەو کاتەدا هەڵەبجە سەر بە سلێمانی بووە، پێشتریش دەنگ بۆ جیابوونەوە لە دەوڵەتی عێراقدا بوو،[2] بۆیە لەلایەن کاربەدەستانی ئینگلیزەوە ئاگادارکرایەوە کە هەڵوێست لە سلێمانیدا ئاڵۆزەو هەڵەبجەش پێویستی بە کەسێکی شارەزا هەیە، حاکمی سیاسی هەڵەبجە هەروەك (ئیدمۆندز) خۆی ئاماژەی بۆ دەکات کە دەبوایە ئەو جێگەی بگرتایەتەوە بە تەواوی ورەی لە دەست دابوو، خەریك بووە مێشکی تێك بچێت، لەلایەکی ترەوە عەشایری ناوچەی هەورامان بە سەرۆکایەتی مەحمود خانی دزڵی سەرلەنوێ لە کوردستانی ئێرانەوە پەلاماری دەشتی شارەزووریان دەدا، ژمارەیەکیش لەو گوندانەی کە دەکەوتنە ناوچە سنوورییەکان بە دیوی عێراقدا، ڕێگەیان بە کارمەندەکانی حکومەت نەدەدا بۆ کۆکردنەوەی باجو تەنانەت هەڵسەنگاندنی ڕادەی باجی بەرهەمەکانی سروشتیش بڕۆنە گوندەکانیان.[3]

هەڵەبجە کە شاری پێراگەیشتن بە کاروباری بەڕێوەبردنو بازاڕو سەوداو مامەڵە بوو لە دوا خاڵی باشووری ڕۆژهەڵاتی دەشتی شارەزوورو لە بن بەرزترین خاڵی هەورامانو لە دڵی وڵاتی جافەکاندا هەڵکەوتبوو.[4] جێگری حاکمی سیاسی هەڵەبجە (لین) خانووی (حامید بەگ)ی جاف بۆ کاروباری بەڕێوەبردن لەدەستدابووە. ئەو خانووە دوای بەشداریکردنی حامید بەگ لە شۆڕشی یەکەمی شێخ مەحمود لە ساڵی 1919دا دەستی بەسەردا گیرابوو لەلایەن (لین)ەوە.[5]

دوای وەرگرتنی جێگری حاکمی سیاسی هەڵەبجە لەلایەن (ئیدمۆندز)ەوە، یەکەم شت کە جێگری گواسراوە پیشانی ئەویداوە، هەروەك خۆی باسی لێوە کردووە، ڕەهەندێك بووە کە جێگرەکەی پێش ئەو (واتە لین) بۆ هەڵهاتن لە کاتی هێرشی لایەنگرانی شێخ مەحمود لە ناوچەکەدا هەڵی کەندبوو.[6]

لە کاتی هاتنی ئیدمۆندز بۆ هەڵەبجە، کەسایەتی سیاسی ناوچەکە عادیلە خانم بوو، خانم بە هۆی (ئەحمەد بەگ)ی کوڕی کە بە شێوەیەکی ڕەسمی قایمقامی هەڵەبجە بوو، دەسەڵاتی خۆی دەپاراستو دابین دەکرد، بەڵام بەڕێوەبەرو مەئمورەکانی ئاسایی حکومەت فەرمانیان لە جێگری حاکمی سیاسییەوە وەردەگرتو ئەویش بڕیارە گرنگەکانی لە ناوەندی قەزاوە بۆ دەهات. (داود بەگ)[7] یش، کە نوێنەری لقێك لە بنەماڵەکانی کەیخەسرەو بەگی بوو، سەرۆکی شارەوانی شارەکە بوو.[8]

لە سەرەتای هاتنی ئیدمۆندزدا دوو لیژنەی نوێنەرایەتی شێخەکانی نەقشبەندی کە بریتی بوون لە (شێخ حسامەدین)ی تەوێڵەو (شێخ عەلادین)ی بیارە سەردانیان کرد بە مەبەستی دەربڕینی خۆشحاڵی خۆیان لە بەرامبەر هاتنیدا بۆ

---

[1] ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو, ب2, ل158ـ159. س

[2] ـ ڕەسوڵ هاوار بەئاماژەکردن بەڕاپۆرتێکی نهێنی ناوئەرشیفی وزاری بەریتانیا سەبارەت بەهەڵوێستی ناوچەی سلێمانی بۆلکاندنیان بەعێراقەوە کەبۆ دووەم جار لە 8 ی مایسی 1921 ئەنجام دراوە دەڵێ: بەڵام لەهەڵەبجە بەهۆی بەگزادەکانی جافەوە دەنگی لایەنگری بۆچوونە پاڵ عێراق لەشوێنەکانی تری ناوچەی سلێمانی زیاتربوو, بەڵام نەی وتووە ژمارەکان چەند بووە. (سەرچاوەی پێشوو, ب2, لەندەن, 1991, ل98)

[3] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو، ل159ـ160.

[4] ـ هەمان سەرچاوە، ل81.

[5] ـ احمد خواجە: قیام شیخ محمود، جلد اول، ل110" ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو، ل162.

[6] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو، ل163.

[7] ـ بەبڕوای ئێمە ئەم داود بەگە داودبەگی حەمەسەعید بەگە کە ئیدمۆندز باسی دەکات.

[8] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو، ل201.

ناوچەکە. ئیدمۆندز بە مەبەستی ڕاپەڕاندنی هەندێك ئیشوكار سەردانی کەلاری کرد، لە ئامادەنەبوونی ئیدمۆندز لە شاری هەڵەبجەدا بارودۆخی ئەو شارە ڕووی لە ئاڵۆزی کرد، لە گەڕاندنەوەیدا لە دەروازەی شاری هەڵەبجە تووشی تەلگرافچییەکی (ئینگلیزی ـ هیندی)و ژمارەیەك لە پۆلیس بوو، ئەو پێی ڕاگەیاند کەوا ئاگادار کراون عەشایەرێکی زۆر لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا بۆسەیان بۆ داناوە، بۆیە گروپێکی بەهێزی پۆلیسیان لە سلێمانییەوە بۆ ناردووی تا چاوێریت بکەن. تەلگرافچییەکە ئەوەشی بە ئیدمۆندز ڕاگەیاند کە ئاگاداری عەشایرەکانی کردووە کە ئەو ئالآیەی لەبەر دەرگای سەرای هەڵەبجە هەڵکراوە داناگرێت، ئەگەرچی هەر شێکیش ڕوویدات. لەلایەکی ترەوە جافەکان وەك پێویست لە ژێر فەرماندا نەمابوون، کە ئەوەش دەیتوانی زیانێکی گەورە بداتو باردۆخێکی خراپ بهێنێتە ئاراوە. ئەم ڕووداوەش ڕادەی ئاڵۆزیو شێواوی بارودۆخی ناوچەکەی نیشان دەدا.[1]

دوابەدوای ئیدمۆندز، نوئێل هات تا بەرپرسیارێتی شارەکە لە ئەستۆ بگرێت، بە ئیدمۆندزیش وتراوە کە بچێتە ڕانیەو بە شێوەیەکی کاتی سەرپەرشتی ئەو ناچەیە بکات، بەڵام بەر لەو ڕۆشتنەی (ئیدمۆندز) لەگەڵ (نوئێل)دا دوو گەشتیان بەیەکەوە بۆ گوندەکانی دەرەوەی هەڵەبجە ئەنجامداوە.

گەشتی یەکەم، لە هەڵەبجەوە بە ڕێگای شارەزووردا ڕۆیشتوون بۆ گوندەکانی (مووان)، هۆی ئەم گەشتەش، دیدارو وتوێژ بووە لەگەڵ (گۆڵدسمث) سەبارەت بە بارودۆخی سیاسی ناوچەکە.

گەشتی دووەم، بە مەبەستی وتووێژ لەگەڵ (مەحمود خانی دزڵی) سەرۆکی تایفەی (بارام بەگییەکان) بوو، کە لە مانگی ئەپریل بۆ گوندی (یالآنپێ) لە بنارەکانی هەورامان ئەنجامی گرت، هەروەك دەزانرێت مەحمود خان دوای ئازادبوونو گەڕانەوەی لە بەندینخانەی هیندستان جارێکی تر دەستی دایەوە دژایەتیکردنی ئینگلیزەکان،[2] بەلآم دواتر لە مانگی مارتدا فشاری فرۆکە مەحمود خانی ناچارکرد پەیوەندی بە ئینگلیزەکانەوە بکات.[3]

لەو ڕاپۆرتەی کەئینگلیزەکان دەربارەی کاروباری عێراق لەماوەی نیسانی 1922بۆ مارتی 1923 داویانەتە (کۆمەڵەی گەلان) هەروەك د.کەمال مەزهەر باسی کردووە بەدرێژی باسی هەڵوێستی کورد بەرامبەر بەهەڵبژاردنی مەلیك فەیسەڵو هەراوبگرەی ناوچەی هەڵەبجەو هەورامانو کوشتنی کاپتن م.مۆتو هەڵوێستی جیاوازی سەردارانی جاف پشدەر دەربارەی گەڕانەوەی شێخ مەحمودو چالاکی کەمالییەکان لەناو باشوری کوردستاندا کراوە.[4] کوژرانی کاپتن م.موت لەکاتی گرتنەبەری ڕێوشوێنێکی ئەمنی سەربازیدا بووە لەناوچەی هەڵەبجەدا بەهۆی نائارامی بارودۆخی ئەوناوچەیەوە، کەجگە لەکوژرانی موت، دوو ئەفسەری لیڤی سلێمانی بەناوەکانی (فەرەج قادروعەلی سەعید) وهەروەها دووانی لیڤی کەرکوك برینداربوون،سەرەڕای پێکرانی فرۆکەیەکی ئینگلیز کەلەکاتی نیشتنەوەیدا لەسلێمانی کەوتووەتە خوارەوەو فرۆکەوانەکەی لەبەر سەختی برینەکەی گیانی لەدەست داوەو زابتەکەی هاوڕێشی بەخەستی برینداربووە.[5]

---

[1] ـ سەرچاوەی پێشوو، ل113.

[2] ـ سەرچاوەی پێشوو، ل113.

[3] ـ سەرچاوەی پێشوو، ل113.

[4] ـ لەو کاتەشی کە کرا بە حاکمی سیاسی، بە شێوەیەکی کاتی ناردیانە هەڵەبجە تاوەکو سەرپەرشتی ناوچەکە بکات. (ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو، ل159).

[5] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو، ل224.222.

[6] ـ د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەك لە، ب1، ل118.

[7] ـ هەمان سەرچاوە, ل119.

[8] ـ ڕ(پێشکەوتن)، ژ(131)، 1922/6/8.

هەروەها چەند جارێك لەو لاپەڕانەی ڕاپۆرتی نیسانی 1923 تاوەکو کانونی دووەمی 1924ی ئینگلیز سەبارەت بە کاروباری عێراق باسی بۆمبارانی سلێمانیو هەڵەبجەو شوێنی تری کوردستان لەلایەن فڕۆکەکانی بەریتانیای گەورەوە کراوە، [1] ئەو بۆمبارانانە بە شێوەیەك بوون کە نوری سەعید سەرۆك وەزیرانی عێراق بڵێ: "ئەگەر هێزی ئینگلیزو فڕۆکەی ئینگلیز نەبوایە عێراق نەیدەتوانی بە ئاسانی دەست بەسەر ناوچەی هەڵەبجەو پێنجوێندا بگرێو نەشی دەتوانی لە دواییدا شۆڕشەکانی ناوچەی بەرزان دامرکێنێتەوە".[2]

لە سەردەمی دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی ئینگلیزەکان لە سلێمانی لە ڕێکەوتی 5/حوزەیران/1923 عیزەت بەگی کوڕی عوسمان پاشا کراوە بە سەرۆکی شارەوانی سلێمانی، بەڵام ماوەی سەرۆکایەتییەکەی تەنها (9) ڕۆژی خایاندووە.[3]

لە ڕێکەوتی 21/نیسانی/1924دا فڕۆکەیەکی ئینگلیز لە کاتی نیشتنەوەیدا لە هەڵەبجە تەقییەوە. بەر لەوەیش بە مانگێكو چەند ڕۆژێك سێ فڕۆکەی جەنگی هاتنە سەر شەمێرانی نزیك وارماواوە، گوللەی شۆڕشگێڕانی ئەو ناوچەیە تانکی بەنزینی یەکێکیانی پێکاو فڕۆکەوانەکەی ناچاربوو بنیشێتەوە.[4]

لە کانوونی دووەمی 1925 کاتێك کۆمەڵەی گەلان وەفدێکی ناردە کوردستان (ویلایەتی موسڵ) هەتا (گەل پرسی یەك) بە ئەنجام بگەیەنن، چونکە ئینگلیزو تورك نەیانتوانی بە گفتوگۆ کێشەی ویلایەتەکە بەلادا بخەن.[5] بەڵام بەرلەوەی ئەندامانی وەفدەکە بێنە ناوچەکە سەریان لەلەندەنو بەغدادو ئەستەمبوڵو ئەنقەرە داو دوای ئەوە لەکۆتایی کانونی دووەمی ساڵی( 1925)ەوە بەتایبەتی چوونە ناوچەکانی ویلایەتی موسڵ. ڕۆژی (27)ی ئەو مانگە گەیشتە شاری موسڵ خۆی. پاش چەند ڕۆژێك ئەندامانی لیژنەو یاریدەدەرانیان بەجیا چونە شارو شاروشارۆچکەکانی تری ناوچەکەو لەهەولێروکەر کوکو سلێمانی بەتایبەتی مانەوەو پێوەندیان بەزۆرکەسەوە کردو مانگی نیسان گەڕانەوە (جنێف) لەوێ کەوتنە دانانی ڕاپۆرتی خۆیان کەڕۆژی (16)ی تەموزی ساڵی 1925 تەواویان کردو بەسەر ئەندامانی (کۆمەڵەی گەلان)و ژمارەیەك ڕۆژمانووسدا دابەشیان کرد.[6]

پێشترو بەر لە گەیشتنی لیژنەکە بەشاری سلێمانی (جەواد پاشا)ی نوێنەری تورکیا بۆ کۆمیسیۆنی موسڵ لیستێك ناوی دا بە (پاوڵس)ی ئینگلیز بۆ ئەوەی بیدات بە ئیدمۆندز، بەو بیانووەی کە ئەمانە بۆ بڵاوکردنەوەو پروپاگەندە دژی تورك هاتوونەتە سلێمانی بەر لە هاتنی لیژنە، کە ئەو لیستە ناوی هەریەکە (ئەحمەد موختارو کەریم بەگی فەتاح بەگ)ی تێدابوو، بۆیە جەواد پاشا داوای کرد کە ئەوانە لە شار دەربکەنو دووریان بخەنەوە.[7]

سەرەڕای ئەو هەموو بەرهەڵستکاریو بەرەنگاریەی کورد لە بەرامبەر لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراقەوە، کۆمەڵەی گەلان لەڕۆژی 1925/12/16 دا بڕیاریدا ویلایەتی موسڵ بخرێتەوە سەرعێراق.[8]

[1] ـ د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەك لە، ب1، ل12.

[2] ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرشاوەی پێشوو، ب2، ل571.

[3] ـ عەبدولخالید صابر: سەرۆك شارەوانییەکانی سلێمانی (1890 – 2003)، 2003، ل60. ئەکرەمی مەحمودی ساڵح ڕەشە : شاری سلێمانی، ب1، چ2، 1987، ل439.

[4] ـ د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەرەیەك لە، ب2، ل43.

[5] ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو، ب2، ل621.

[6] ـ د.کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەك لە, ب1, 114 .

[7] ـ ئیدمۆندز: سەرچاوەی پێشوو، ل500.

[8] ـ ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی : سەرچاوەی پێشوو, ل216 .

ئەوەی ڕاستی بێت ئەحمەد موختار جاف وەکو پیاوێکی سیاسی تێگەیشتووو شارەزا نەك هەر چاوەڕێی شتی وای[1] لێنەدەکردن کە لە بەرژەوەندی کورد بڕیار بدەن، بەڵکو هەموو بڕیارەکانی بە قسەی پووچو بێکەڵك لە قەڵەم دەدان:

دێتە گوێم دەنگی بەسۆزو شیوەنو گریانەوە
ناڵەی دڵمە لەحەسرەت خاکی کوردستانەوە
لانەوازو بێکەس‌ومەزلۆمن ئێستە قەومی کورد
گابەدەستی تورکانو گابەدەس ئێرانەوە
ئیسمی ویجدانو عەدالەت بێ موسەمایەو درۆ
بۆسیاسەت ئەم قسەکەوتۆتە سەرلێوانەوە
ڕاستە گەرئیسمی عەدالەت بۆچی منداڵانی کورد
وێڵو سەرگەردان بسورێێ بەسەرکێوانەوە
هێندە حیزە بەختی کورد بۆکوشتنو تاڵانیان
کۆمەڵێ هاتوون بەسواری ئەسپو حوشتری پێپانەوە
حاڵی کورد ئێستا لەبەینی تورکو ئێرانو
بێچوە تەیرە کەوتووەتە داوی منداڵانەوە
ئەم قەراری عوسبەیە، وا خەڵکی ئەڵێن بۆ کورد ئەبێ
هەر قسەی ڕووتە، قسەش ناچێتە ناو گیرفانەوە[2]

هەر بۆیە بڕوای بە (کۆمەڵەی گەلان) نەبوو، دەیزانی کە نوێنەری دەوڵەتە گەورەکانەو بۆ سوودو قازانجی ئەوان کاردەکاتو بڕیار دەدات، نەك بۆ چاکەی میللەتە بێ بەشو ماف خوراوەکان.[3] (ڕەسوڵ هاوار)یش بە ڕوونی باسی لەوە کردووە کە ئەحمەد موختاری شاعیر لە هەریەکە لە (پیرەمێردو مستەفا پاشای یامولکی)[4] باشتر لە (کۆمەڵەی نەتەوەکان)و بڕیارەکەیان گەیشتبوو.[5]

بەسەرنجدان لەباروودۆخی ئەوسەردەمە هەڵوێستێکی پێچەوانەی ئەم بۆچونەی ئەحمەد موختارمان بەرچاودەکەوێت، لەم بارەیەوە ڕۆژنامەی( ژیانەوە) باس لەوە دەکات کەهەردوو ڕۆژ لەپاش دەرچوونی ئەو بڕیارە لەلایەن (کۆمەڵەی گەلان)ەوە واتە ڕۆژی 1925/12/28 دوای ئەوەی لەڕێگەی برووسکەوە ئەو بڕیارە دەگاتە شاری هەڵەبجە لەلایەن قایمقامی هەڵەبجەوە( ڕۆژنامەکە ناوی قایمقامی نەهێناوە بەڵام بێگومان لەوکاتەدا حایدبەگ قایمقامی شارەکە بووە) ئاهەنگێکی گەورە سازدراوە لەحەوشەی سەرای شارەکەدا بەوبۆنەیەوە، لەوئاهەنگەدا جگەلە ئەفسەری پەیوەندی ئینگلیز کاپتن(مور) و زۆرێك لەئەفسەرانی سەربازی شارەکەو قوماندانی سەربازی (جەمیل بەگ) و بەگزادەکانی جافـو زۆرێکی تر لەناودارانی شارەکەو دەوروبەری بەشداری ئەو ئاهەنگەیان کردووە.

---

[1] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو, ل187.
[2] ـ د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ: سەرچاوەی پێشوو, ل134.
[3] ـ عەبدولکەریم حەمید عەبدولکەریم: سەرچاوەی پێشوو، ل178. ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو، ب2، ل637.
[4] ـ بۆ زانیاری لە بارەی بۆچوونی ئەم دوو کەسایەتییە بڕوانە (ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو، ب2، ل636ـ637).
[5] ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو، ب2، ل637.

رۆژنامەی ناوبراو لەسەر ئەو بابەتە دەڕواو جگە لەوەی ئەو بڕیارەی (کۆمەڵەی گەلان) وەك مژدەیەکی خۆش بۆخەڵکی ناوچەکە باس دەکا، باسیش لەڕادەی ئەو خۆشی دەربڕینەی بەشداربووانی ئاهەنگەکە دەکات بەبۆنەی دەرچوونی ئەو بڕیارەو ڕزگاربوونی یەکجارەکیان لەزۆڵمو زۆری تورکەکان، ڕۆژنامەکە دەڵێت: "بەشداربووان بەوبونەیەوە پیرۆزباییان لەیەك کردووە تەنانەت زۆرێك لەئامادەبووانی ئەو ئاهەنگە لەخۆشیدا گریاون. لەوئاهەنگەدا چەند وتارو بابەتێك خوێندراوەتەوەو پێشکەش کراون، لەو وتارانەدا بەتێکڕا زۆرسوپاسی کۆمەڵەی گەلانو بەتایبەتی حکومەتی ئینگلیز کراوە".[1]

لە ڕێکەوتی 2/مایسی/1925 (هێنردۆبس)ی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە عێراق هات بۆ کەرکوك بۆ سەرپەرشتی کردنی کۆنگرەیەکی[2] گەورە بۆ جێبەجێ کردنی پیلانی لەناوبردنی شێخ مەحمود. بەشدارانی ئەو کۆنگرەیە بە دوورودرێژی باسیان لەو ڕێوشوێنە سەربازییانە کرد کە پێویستە بگیرێتە بەر بۆ دامرکاندنەوەی شێخ مەحمودو خەرجی پێویستیان بۆ دیاری کردو پوختەی ئەو کرنگرەیەیان لە پێنج خاڵی سەرەکیدا تۆمارکرد.[3]

هێنری دۆبس دوای گەڕانەوەی بۆ بەغداد ڕاستەوخۆ بڕیارەکانی کۆنگرەی لەگەڵ فەرماندەی گشتی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عێراق هەڵسەنگاند، ئەویش هەموویانی پەسەندکرد، تەنها ئەو خاڵەیان نەبێت کە دەربارەی گواستنەوەی فەوجێکی لیڤی بوو بۆ هەڵەبجە، فەرماندەی گشتی پێی وابوو ئەو لایەنەی بڕیارەکان پێویستی بە لێکۆڵینەوە هەیە.[4]

ڕەسوڵ هاوار بە پشت بەستن بە بەڵگەنامە ئینگلیزییەکان خۆیان دەڵێت: "لە ڕێکەوتی 1926/4/1دا شێخ مەحمودو ژمارەیەك لە لاینگرانی لە قەرەداغەوە هەڵهاتنو بەسەر ناوچەی تانجەرۆدا گەیشتنە ناوچەی هەڵەبجەو دەستیانکرد بە کۆکردنەوەی باج لە هەندێ دێهاتی شارەزووردا، زۆربەی ئەوانەی لەگەڵ شێخ مەحموددا بوون جگە لە چەند خزمو کەسێکی نزیکی تایبەتی خۆی ئەوانی تر بڕیاریاندا لە شارباژێڕ بمێننەوە، شێخ مەحمود خۆی سەردانی (شێخ حوسامەدین)ی تەوێڵەی کردووە، شێخ حسامەدین ئامۆژگاری شێخ مەحمودی کردبوو خۆی تەسلیمی ئینگلیزەکان بکات، لە ئەنجامی ئەوەدا شێخ مەحمود نامەیەکی نارد بۆ (مەلیك فەیسەڵ)، لەو نامەدا شێخ مەحمود ئامادەیەیی خۆیی دەربڕی کە نوێنەرێکی خۆی بنێرێت بۆ بەغدا، بەڵام نووسیبووی لەم کاتەدا خۆی ناتوانێ بچێتە بەغدا".[5]

لە ڕێکەوتی 1926/6/16دا هێزێکی ئینگلیز ڕوویکردە خورماڵ، لەبەر ئەوەی ئەو ناوچەیە نزیکەی (600) چەکداری لایەنگری شێخی لێبوو، لە شەڕێکدا لەو ناوچەیە (کاپتین Bordie) بریندار کراو ئینگلیزەکان بڕیاریاندا بنکەیەکی سوپایی هەمیشەیی لە خورماڵدا دامەزرێنن.[6]

پاش چەند ڕۆژێك لە 1926/7/2دا (مێجەرElphinsone) کە سەرکردەی لەشکری عێراق بوو، بە پیادە لە هەڵەبجەوە بەڕێکەوت بەرەو خورماڵ بۆ ئەوەی ڕاپۆرتێك ئامادە بکات کە ئایا خورماڵ دەست دەدات بۆ ئەوەی بکرێت بە بنکەی لەشکری عێراق بۆ ئەو ناوچانە؟ بۆ ئەم مەبەستەش بۆردومانی (کانی گوڵ)و (یالانپێ)و گردە بەرزەکانی

---

[1] ـ ژ (18)، 1926، حەکیم مەلا سالح: سەرچاوەی پێشوو، ل277ـ278 .

[2] ـ بەشدارانی ئەو کۆنگرەیە بریتی بوون لە (هێنری دۆبسو سەرۆك وەزیران یاسین هاشمیو جێگری سەرکردەی هێزی ئاسمانی بەریتانی لە عێراق (دۆدنگ)و جێگری سەرلەشکری بەریتانی لە عێراقو ڕاوێژکاری وەزارەتی بەرگری لە عێراق (کۆلۆنێل کامرۆن)و یاریدەدەری ڕاوێژگاری وەزارەتی کاروباری ناوخۆی عێراقو سەرپەرشتیاری کارگێڕی سلێمانیو سەرکردەی کەرت ڕۆبو سەرپەرشتیاری کارگێڕی کەرکوکو سەرپەرشتیاری پۆلیس لە کەرکوك). (د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەك لە، ب2، ل93)

[3] ـ د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەك لە، ب2، ل93ـ94.

[4] ـ عومەر مەعروف بەرزنجی: سەرچاوەی پێشوو، ل111، د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەك لە، ب2، ل95.

[5] ـ ڕەسوڵ هاوار: سەرچاوەی پێشوو، ب2، ل580.

[6] ـ هەمان سەرچاوە، ب2، ل580.

دەورویەری خورماڵ کراو (مولازمی یەکەم Buckly) ڕۆژێك پێشتر هێرشی بردبووە سەر ئەحمەد ئاواو ئەوخەرمانانەی ئەوناوچەیەی هەمووی سوتاند.[1]

لەکۆتایی ساڵی 1928و سەرەتای ساڵی 1929دا لەو ڕاپۆرتە پێنج خاڵییەی کە ڕاپۆرت نووسی ئینگلیزەکان لە سلێمانییەوە بە ناونیشانی (شایعاتی سلێمانی) ناردوویەتی بۆ وەزارەتی فرۆکەوانی ئینگلیز لە عێراق، لە خاڵی سێیەمیدا دەڵێت: "بینا لەسەر قسەی خزمەتکارەکانی حامید بەگی قایمقامی هەڵەبجە ئەمجارە کە چووە بۆ کەرکوك حکومەت بانگی کردووە کە بیکەن بە موتەسەڕیفی سلێمانی، هەرچەندە ئەم قسەیە لەناو بازاڕدا بڵاوکراوەتەوەو هەمووکەسێك ئەم قسەیە تیکرار ئەکاتەوە، لاکین وەکو مەعلوماتم هەیە حامید بەگ دەستی لەجێ چوویوو، بۆ تەداوی ڕۆیشتن بۆ کەرکوکو ڕۆژی (28)ی مانگ ڕەجعەتی کردووە. ئەم شایعەیە بە درۆ مەشهور دەکرێت".[2]

## دەرئەنجام

شاری هەڵەبجە وەك سەرچاوە مێژووییەکان باسی لێوە دەکەن مێژوویەکی دێرینی هەیە کە بۆ سەردەمانی (پ.ن) دەگەڕێتەوە، ئەم شارە لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەو سەرەتای سەدەی هەژدەوە جارێکی تر لەلایەن بنەماڵەی سیانزە ماڵەوە ئاوەدانکراوەتەوە، دواتریش ژمارەیەك لە ماڵە جوولەکەکان لە خورماڵەوە ڕوویان کردە ئەم شارە، جارێکی تر لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە ئەم شارە ڕوویەڕووی شەپۆلێکی نیشتەجێبوونی هۆزی گەورەی جاف بوویەوە، بە شێوەیەك بوو بە گەورەترین مەڵبەندی نیشتەجێبوونی هۆزی جاف.

ئەم هۆزە جگە لەوەی خاوەنی هێزێکی چەکداری تایبەت بە خۆیان بوون، گەورەترین هۆزی باشووری کوردستان بوونو خاوەن قورساییەکی گەورە بوون لە ناوچەکەدا، هەر ئەمەش وای کرد لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە گرنگییەکی زیاتریان پێ بدرێت بە بەراورد بە هۆزو عەشیرەتەکانی تری باشووری کوردستان.

شاری هەڵەبجە لە سەردەمی عوسمانییەکاندا کراوە بە مەڵبەندی قەزاو جافەکان بەڕێوەبردنی کاروباری کارگێڕیو سیاسییان گرتووەتە ئەستۆ، ئەم ئەرکەش لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە پێیان سپێردرابوو، لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە بەگزادەکانی جافو عەشیرەتی جاف بە گشتی لە کێشەو ململانێدا بوون لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی لە ناوچەکەدا. هۆکاری ئەم ناکۆکییەش بۆ ئەوە دەگەڕایەوە سەردارەکانی جاف نەیاندەویست ڕاستەوخۆ بکەونە ژێر بڕیارو ڕاسپاردەکانی دەوڵەتی عوسمانییەوە، هەموو کات هەوڵیان دەدا ئەو سەربەخۆییەی کە پێشتر هەیانبوو بیپارێزن، ئەم کێشانەش بە ڕوونی بە پەیوەندییەکانی نێوان جافەکانو کاربەدستانی دەوڵەتی عوسمانیدا لەو ماوە مێژووییەی کە لێی دواین بە ڕوونی بەرچاو دەکەوێت.

کاتێکیش کە ئینگلیزەکان هاتنە باشووری کوردستان، بە هەمان شێوەی عوسمانییەکان تەماشای ئەم هۆزەیان دەکردو مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردن، هەستیان بە ڕۆڵو گرنگی ئەم هۆزە دەکرد بۆیە هەوڵیاندا پەیوەندی توندو تۆڵی لەگەڵیدا دامەزرێنن. دەرئەنجامی ئەو پەیوەندییانەش بوو، هەموو کات ئینگلیزەکان هەوڵیاندەدا بە قۆستنەوەی کێشەی مێژینەی نێوان جافەکانو بنەماڵەی شێخان، هۆزی جافو شاری هەڵەبجە سەرەڕای ئەوەی لە ڕووی کارگێڕییەوە سەر بە لیوای سلێمانی بوو، لە شێخ مەحمودو دەسەڵاتەکەی دابڕنو وەك ناوچەیەکی سەربەخۆ مامەڵەی لەگەڵدا بکەن یاخود بیبەستنەوە بە ناوچەی کفریو کەرکوکەوە.

---

[1] ـ هەمان سەرچاوە، ل583.

[2] ـ د. کەمال مەزهەر: چەند لاپەڕەیەك لە، ب2، ل304ـ307.

هەمووكات ئینگلیزەكان هەڵەبجەیان وەكو كارتێكی فشار لە بەرامبەر دەسەڵاتدارێتییەكەی شێخ مەحموددا بەكار دەهێنا، بە جۆرێك هەڵەبجە ڕۆڵێكی گەورەی گێڕاوە لە ململانێی سیاسیو سەربازییەكانی نێوان شێخ مەحمودو كاربەدەستانی سەربازی ئەو سەردەمەی ئینگلیزدا.

سەرەڕای هەبوونی پەیوەندی لە نێوان دەسەڵاتدارانی ئینگلیزو سەرۆكەكانی جاف بەتایبەتی خودی عادیلە خانم خۆی، لەگەڵ ئەوەشدا ئینگلیزەكان بێ گیروگرفت نەبوون لە ناوچەكەدا بەڵكو چەند جارێك تووشی ململانێو تەنانەت شەڕیش بوون لەگەڵ خەڵكانێك كە دژی بوونی ئینگلیزەكانو دەسەڵاتەكەیان بوون لە ناوچەكەدا.

ئەوە ماوە كەبڵێین هاوكاری سەرۆكەكانی جافو هۆزی جاف لەوسەردەمەدا بۆدەسەڵاتدارانی ئینگلیز لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو كە جافەكان ئومێدێكی گەورەیان بە ئینگلیزەكان هەبوو كە كارێك بۆ كورد بكەنو كیانێك بۆ كورد دامەزرێنن، بەڵام هەروەك دواتر ڕوونبوویەوە سیاسەتوهەوڵەكانی ئینگلیز نەك پێچەوانەی خواستو ئاواتەكانی خەڵكی هەڵەبجەبوو، دەتوانین بڵێین پێچەوانەی داواكارییەكانی هەموو خەڵكانی باشووری كوردستان بوو.

## سەرچاوەکان

### کتێبە کوردییەکان

ئومێد ئاشنا:

1- مەحمود پاشای جاف (1846 – 1921)، چاپخانەی بینایی، 1999 .

ئەحمەد خواجە:

2- چیم دی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی شەفیق، بەغدا، 1968.

3- چیم دی، بەرگی دووەم، چاپخانەی شەفیق، بەغدا، 1969.

ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی:

4- شاری سلێمانی (1918 – 1932)، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانست، سلێمانی، 2002.

ئەحمەد موختار بەگی جاف:

5- مەسەلەی ویژدان، پێشەکیو لێکۆڵینەوە دکتۆر ئیحسان فوئاد، سلێمانی، 2006.

ئەکرەمی مەحمودی ساڵحی رەشە:

6- شاری سلێمانی، بەرگی دووەم، 1987.

ئەیوب رۆستەم:

7- هەگبەو هەوارگە، چاپی یەکەم، سلێمانی، 2004.

8- هەورامان، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، سلێمانی، 2001.

ئەحمەد باوەڕ:

9- جوولەکەکانی کوردستان (بنەچەیان ـ دابو نەریتیان ـ هۆی کۆچکردنیان)، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، 2000.

بەکر حەمە صدیق عارف:

10- لاپەڕەیەك لە مێژووی هەڵەبجە (1700ـ1958)، چاپی یەکەم، سلێمانی، 1997.

بەختیار غەفور هەڵەبجەیی:

11- کتێبی هەڵەبجە، چاپی یەکەم، 2006.

تاهیر بەگی عوسمان پشای جاف:

55- دیوانی تاهیر بەگ، چاپی سێیەم، چاپخانەی هەولێر، هەولێر، 1966.

جەمال بابان:

12- سلێمانی شارە گەشاوەکەم، بەرگی دووەم، دەزگای رۆشنبیریو بڵاوکراوەی کوردی، بەغداد، 1998.

جەمال بابان، ئاسۆ بابان، ئزمێد خالید:

13- سلێمانی شارە گەشاوەکەم، بەرگی سێیەم، چاپی سێیەم، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، 2000.

حەکیم مەلا ساڵح:

14- هەڵەبجە لە ئامێزی مێژوودا، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی منارە، 2004.

حەسەن فەهمی جاف:

15- مێژووی هۆزی جاف ومەحمود پاشای جاف، چاپخانەی دێکان، 1999.

حەسەن گۆران:

16– دیوانی تاهیر بەگی جاف، چاپی یەکەم، چاپخانەی گلبان، سنندج، 1381شەمسی.

حەبیبوڵای تابانی:

17– هاونەتەوەیی قەومی کوردوماد، وەرگێڕانی جەلیل گادانی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی تیشك، 2004.

ڕەفیق حیلمی:

18– یادداشت، چاپی سێیەم، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، 2003.

ڕەشاد میران:

19– ڕەوشی ئایینیو نەتەوەیی لە کوردستاندا، چاپی یەکەم، کوردستان، 2000.

ڕەمەزان هەمیرخان (کۆساری):

20– هاواروهاواریەکان، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕامان،2005.

سیسیل جۆن ئیدمۆندس:

21– کورد تورك عەرەب، وەرگێڕانی: حامید گەوهەری، دەزگای چاپو بڵاوکراوەی ئاراس، هەولێر، 2004.

سلێمان عەبدوڵلا ئیسماعیل(دکتۆر):

22– تایبەتمەندییەکانی باران لەهەرێمی کوردستانی عێراقدا، سلێمانی، 2006.

سدیق ساڵح:

23– حکومەتی کوردستان (1918 – 1924)، سلێمانی 2003.

شاکر فتاح:

24– گەشتی هەڵەبجەو هەورامان لەساڵی 1933دا، چاپخانەی کامەرانی، سلێمانی، 1974.

شێخ لەتیفی حەفید:

25– یاداشتەکانی شێخ لەتیفی حەفید لەسەر شۆڕشەکانی شێخ مەحمود، ئامادەکردنی کەمال نوری مەعروف، چاپی یەکەم، دهۆك، 1995.

شوان عوسمان مستەفا:

26– کوردستانو پرۆسەی بە ئیسلامکردنی کورد، چاپی یەکەم، سەنتەری چاپو پەخشی تەما، سلێمانی، 2002.

شەوکەت حاجی موشیر:

27– کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە بەهاری 1988، چاپی یەکەم، سلێمانی، 1998.

عەبدولکەریم حەمید عەبولکەریم:

28– ئەحمەد موختار جاف شاعیرو مرۆڤ، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، 2000.

عەبدولجەبار محەمەد جەبار:

29– ئافرەتە ناودارەکانی کورد، چاپخانەی الجمهورية، کەرکوك، 1969.

عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ:

30– دیوانی ئەحمەد موختار جاف، بەغداد، 1986.

عەبدولڕەقیب یوسف:

26– مێجەرنۆئێل سەرنجێکی بارودۆخی کورد، وەرگێڕانی سدیق ساڵح، سلێمانی، 2001.

عەلادین سەجادی:

31– مێژووی ڕاپەڕینی کورد، چاپی دووەم، ئینتیشاراتی محەمەدی، سەقز، 1996.

32– رشتەی مرواری، بەرگی دووەم، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، 2004.

33– ڕشتەی مرواری، بەرگی شەشەم، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، 2005.

عومەر مەعروف بەرزنجی:

34– مەحمود خانی دزلّی شۆڕشگێڕی ڕۆژهەلاّتی کوردستان، چاپی دووەم، چاپخانەی ئازاد، سلێمانی، 2000.

35– نوربەخشی (شیعرەکانی مەلیکی کوردستان شێخ مەحمود)، چاپی یەکەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، 2006.

عەبدولخالد صابر:

36- سەرۆك شارەوانییەكانی سلێمانی (1890ـ2003)، چاپخانەی شڤان، 2003.

كەریم بەگی فەتاح بەگی جاف:

37- تەئریخی جاف، لێكۆڵینەوەی دكتۆر د. حەسەن جاف، (دار الكتب والوثائق)، بەغداد، 1995.

كلۆدیۆس جیمس ریچ:

38- گەشتی ریچ بۆ كوردستان 1820، وەرگێڕانی: محەمەد حەمە باقی، چاپی یەكەم، تەورێز، ئێران، 1992.

كەمال مەزهەر (دكتۆر):

39- چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی كورد، بەرگی یەكەم، چاپخانەی (الأدیب البغدادیة)، بەغداد، 1985 .

40- چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی كورد، بەرگی دووەم، چاپی یەكەم، دەزگای چاپو بڵاوكردنەوەی موكریانی، هەولێر، 2001.

كەرم زەند:

41- جوگرافیای كوردستان، چاپی دووەم، سلێمانی، 2005.

كۆمەڵێك لە پسپۆڕانو ئەفسەرانی سیاسی ئینگلیز:

37- كوردو كوردستان، وەرگێڕانی: حسێن عوسمان نێرگسەجاڕیو حسێن ئەحمەد جاف، چاپی یەكەم، بڵاوكراوەی ئاراس، 2002 .

مەلا عەبدوڵڵای زێوەر:

42- گەنجینەی مەردانو یاداشتی ڕۆژانی دەربەدەری، ئامادەكردنی: محەمەدی مەلا كەریم، چاپخانەی (الأدیب)، بەغداد، 1985.

محەمەد ڕەسوڵ هاوار:

43- شێخ مەحمودی قارەمانو دەوڵەتەكەی خوارووی كوردستان، بەرگی یەكەم، لەندەن، 1990.

44- شێخ مەحمودی قارەمانو دەوڵەتەكەی خوارووی كوردستان، بەرگی دووەم، لەندەن، 1991.

محەمەد ئەمین زەكی بەگ:

45- تەئریخی سلێمانی وە وڵاتی، بەرگی سێیەم، چاپی سێیەم، سلێمانی، 2006.

46- خولاسەی تەئریخی كوردو كوردستان، بەشی یەكەمو دووەم، چاپی دووەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، 2004 .

مارف خەزنەدار (دكتۆر):

47- مێژووی ئەدەبی كوردی، بەرگی چوارەم، چاپی یەكەم، چاپو بڵاوكردنەوەی ئاراس، هەولێر، 2006.

میرزا محەمەد ئەمین مەنگوڕی:

48- حەقائقی بەسەرهاتی شێخ مەحمود لە پەنای ئیستقلالی كوردا، چاپخانەی ڕۆشنبیری، سلێمانی، 2003.

مەحمود عەزیز حەسەن:

49- كورتەیەك لە مێژووی هۆزی جافو باسی هەندێك لە تیرەكانی، چاپخانەی نەورەس، سلێمانی، 1985.

میر بەسری:

50- ناودارانی كورد، وەرگێڕانی: عەبدولخالق عەلائەدین، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، 2002.

مینۆرسکی:
51- کورد، وەرگێڕانی: حەمە سەعید حەسەن حەمە کەریم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، 1984.

میر شەرەفخانی بەدلیسی:
52- شەرەفنامە، وەرگێڕانی: هەژار، چاپی سێیەم، چاپو بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، 2006.
محەمەدی مەلا کەریم:
53- دیوانی بێخود، چاپخانەی (سلمان الأعظمي)، بەغدا، 1970.
محەمەد ئەمین هەورامانی:
54- مێژووی هەورامان، بەرگی یەکەم، تهران ـ 1380 هەتاوی.
نەوشیروان موستەفا ئەمین:
55- کوردستانی عێراق سەردەمی قەڵەمو موراجەعات، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، 1999.
نادری ئینتیسار:
56- ئیتنۆ نەتەوایەتی کوردی، وەرگێڕانی عەتا قەرەداغی، چاپخانەی تیشك، سلێمانی، 2004.
هێنی هارۆڵد ولسن:
57- ژیانی ئافرەتی کورد، وەرگێڕانی: عەزیز گەردی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری، بەغداد، 1983.
هادی ڕەشید بەهمەنی:
58- پەیامی هەورامان، چاپی یەکەم، چاپخانەی ژین، هەولێر، 2001.
واسیلی نیکتین:
59- کوردو کوردستان، وەرگێڕانی: خالید حوسامی (هێدی)، چاپی یەکەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، 1998.

## کتێبە عەرەبییەکان

جمال بابان:
60- اعلام كرد العراق، مطبعة شڤان، سليمانية، 2006.
شاكر خصباك (دكتور):
61- الأكراد دراسة جغرافية أثنوغرافية، مطبعة شفيق، 1972.
62- العراق الشمالي، طبعة الأول، بغداد، 1973.
عبدالرزاق الحسني:
63- تأريخ الوزارات العراق، جزء العاشر، دارالشؤون الثقافة، بغداد، 1988.
فؤاد حمه خورشيد:
64- العشائر الكردية، بغداد، 1979.
محمد علي الصيوركي (دكتور):
65- معجم أعلام الكرد في التأريخ الاسلامي والعصر الحديث في كردستان وخارجها، مؤسسة ژين، سليمانية، 2006.

محمد امين زكى:

66- مشاهد الكرد والكردستان في العهد الاسلامي، جزء الثاني، مطبعة السعادة، مسر، 1947.

ميجرسون (مرزا غلام حسين شيرازى):

67- رحلة متنكر الى بلاد ما بين النهرين وكردستان، ترجمة فؤاد جميل، جزء الأول، مطبعة الجمهورية، بغداد، 1970.

مكرم الطالباني (دكتور):

68- حزب هيوا، مطبعة خاك، سليمانية، 2002.

## كتێبە فارسییەکان

احمد خواجه افندى:

69- قيام شيخ محمود برزنجى و مردم كرد عليه استعمار بريتانيا در كردستان، جلد أول، چاپخانەی روستەم خانی، سنندج، 1380.

كريم سنجارى (دكتور):

70- ايل سنجابى ومجاهدت ملى ايران، چاپ اول، تهران، 1380.

## کتێبی ئینگلیزی

71- Susan meislas: Kurdistan the shadow of history، 1997.

## گۆڤارە کوردییەکان

ئەحمەد عینایەت:

72- ئایا بەندکردنی ئەحمەد موختار جاف لە ئەشکەوتی جاسەنە لە جێگای خۆیدا بووە؟، گۆڤاری ڕەنگین، ژمارە 120، 1999.

بەکر حەمە صدیق عارف:

73- هەڵەبجە قوربانی ڕقی تۆڵەکردنەوە لە مێژوودا، گۆڤاری هەڵەبجە، ژمارەی تایبەت، 2002/3/16.

74- هەڵەبجە لە ئاوێنەی چەند دێڕێکی مێژوودا، گۆڤاری خەزان، ژمارە (4)، 2001/3/16.

75- پارێزگاری سلێمانی، ساڵنامەی سلێمانی، 1999.

جەمال بابان:

76- ئەم ناوانە لە چییەوە هاتوون؟، گۆڤاری زانیاری، ژمارە (1)، ساڵی یەکەم، 1970.

جەمال ئیبراهیم لۆلۆ:

73- مێژووی جوولەکە لە کوردستاندا، گۆڤاری خاك، ژمارە (113)، 2006.

چنور فایەق تۆفیق:

77- کارەساتی کیمیابارانی هەڵەبجە، گۆڤاری هەشتاو هەشت، ژمارە (5و6)، 2006.

حەسەن جاف (دکتۆر):

78- با وردتر لە ڕووداوە مێژووییەکان بکۆڵینەوە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (116)، 1987.

79- نەخشی هۆزی جاف لە سایەی چەند سەرۆکێکییەوە لە مێژووی کورددا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، بەرگی 21 – 22، بەغداد، 1990.

80- وێنەیەکی یادگاریو هەڵوێستێکی مەردانەی مەحمود پاشای جاف، گۆڤاری ڕەنگین، ژمارە 52، 1993.

81- چەمكێك لە ژیانی مەحمود پاشای جاف (1261ك/ 1846ز ـ 1339ك/ 1921ن)، گۆڤاری نەوشەفەق، ژمارە (39)، 2006.

رەئوف مەحمود:

82- لاپەڕەیەكی شكۆداری سەردەمی شێخ مەحمود، گۆڤاری بەیان، ژمارە (151)، 1989.

سەلاحی حەمەی زەینەب:

83- هەندێ لە جوولەكەكانی خەڵكی ئەم شارەو شاری هەڵەبجە، گۆڤاری سلێمانی، ژمارە (73)، 2006.

شێخ عەلی:

84- چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی هەڵەبجە، گۆڤاری هەڵەبجە، ژمارەی تایبەت، چاپی یەكەم، سەنتەری چاپ و پەخشی تەما، سلێمانی، 2002/3/16.

شەیدا محەمەد ئەمین:

85- هەڵەبجەو چركەساتەكانی كیمیاباران، گۆڤاری هەشتاو هەشت، ژمارە (5و6)، 2006.

عەبدولخالید سابیر:

86- ویلایەتی موسڵ لە ساڵنامەی عوسمانیدا، گۆڤاری هەزارمێرد، ژمارە 26، 2005.

فەیروز حەسەن:

87- هەڵەبجە نشینگەی جاف و گۆران، گۆڤاری هەڵەبجە، ژمارەی تایبەت، 2002/3/16.

قادر حەمەجان عەزیز:

88- چەكمێك لە خەباتی كورد لە خوارووی كوردستاندا، گۆڤاری سلێمانی، ژمارە(6)، 2000.

كەشكۆڵ:

89- هەڵەبجە لە هەڵدێری مێژوودا، گۆڤاری خەرمان، ژمارە (8)، 1993.

كەیوان ئازاد ئەنوەر:

90- هۆزە كوردەكانی كوردستانی عێراق، گۆڤاری پەیڤین، ژمارە (9)، سلێمانی، 2000.

گۆران هەڵەبجەیی:

91- هەڵەبجەو كارەسات، گۆڤاری پەیڤ، ژمارە (10و11)، 1989.

محەمەد سەعید جاف:

92- هەڵوێستێكی جوامێرانە، گۆڤاری ڕەنگین، ژمارە (68)، 1994.

موكەڕەم تاڵەبانی:

93- دەرەبەگێتی لە كوردستانا، گۆڤاری زانیاری، ژمارە (3)، 1970.

هۆشمەند عەتا مەحمود:

94- خوێندنەوەیەك بۆ مێژووی هەڵەبجە، گۆڤاری هەشتاو هەشت، ژمارە (5و6)، 2006.

95- نمونەی ئافرەتانی ناوچەی سلێمانی لە مێژوودا، گۆڤاری بابان، ژمارە (1)، 2006.

**گۆڤارە عەرەبییەكان**

حسام الدین نقشبندی (دكتور):

96- المدن القدیمة المندرسة في محافظة السلیمانیة وتعینیية مواقعها، گۆڤاری كاروان، ژمارە (34)، 1985.

## رۆژنامەکان

پێشکەوتن

97- ژمارە (29)، 1920/11/11.

98- ژمارە (22)، 1920/9/23.

99- ژمارە (46)، 10/ مارت /1921.

100- ژمارە (62)، 1921/6/30.

101- ژمارە (54)، 1921/5/5.

102- ژمارە (131)، 1922/6/8.

بانگی کوردستان

103- ژمارە (6)، 1922/9/18.

104- ژمارە (9)، 1922/10/8.

رۆژی کوردستان

105- ژمارە (13)، 1341 کۆچی.

کوردستانی نوێ

106- ع. بەسۆز: ئاوڕێکی تر بەرەو شۆڕشەکانی شێخ مەحمود، ژمارە (1570)، 1998/3/5.

107- جەمال بابان: یا عەبابەیلێ بەرەو ڕووت هاتم هەڵەبجە خۆشەکەی گوڵی ولآتم، ژمارە (3940)، 2006/4/11.

108- بەختیار غەفور هەڵەبجەیی: شوێنەواری کۆشکی وەسمان پاشای جاف لە هەڵەبجە، ژمارە (2281)، 2000/10/19.

رۆژنامەی کۆمەڵ

109- ئارام عەلی سەعید: قولەکانی ماڵی پاشا شوێنی نووسینی شیعری ئەحمەد موختار بەگی جاف بوو، ژمارە (232)، 2006/7/22.

## چاو پێکەوتنەکان

110- چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (حەمیدە ئەحمەد موختار جاف)، 2006/12/16، سلێمانی.

111- چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (خوشکان حەمە فەرەج کوێخا)، 2007/2/8، هەڵەبجە.

112- چاوپێکەوتنی توێژەر لەگەڵ (حاجی تۆفیق)، 2007/2/9، هەڵەبجە.

113- کاسێتی تۆمارکراوی بڵاونەکراوە، (چاوپێکەوتنی حاجی عەبدولقادری عەبابەیلێ)، 2001/1/24، هەڵەبجە.

تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان

114- بەرنامەیەکی تایبەت بە هەڵەبجە، 16ـ2006/3/17.

# پاشکۆ


Letter from Adela Khanum to me in 19:
Lynette Soane.

ئەونامەیەی کەعادیلە خانم ناردویەتی بۆ(لینیت سۆنی )



وێنەیەکی کەیخەسرەوی جاف
وەك لە گەشتەی (ریچ) دا هاتوە



She was of great service to
the British during the occupation
([illegible] Soane)
Princess Adela Khanam (K.B)
(Khan Bahadur)
of Halabja S. Kurdistan
my dear Kurdish friend
a ruler of Halabja
now [illegible]

( عاديله خانم )



(ئەحمەد بەگ ،کاپتن لیز، میجەرسۆن، عادیلە خانم، لینیتا سۆن) 1920لەم وێنەیە
گیراوە لە کۆشکی
وەسمان پاشا(واتە ماڵی عادیلە خانم)



# بڵاوكراوەكانی پرۆژەی ( تیشك )

| زنجیره | ناوی كتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| 1 | بەئیسلامكردنی كورد، ماستەرنامە یان هەڵنامە ؟ | ن: فازل قەرەداغی |
| 2 | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەكارییەكانی مەریوان هەڵەبجەیی لە كتێبی (سێكس و شەرع و ژن)دا | ن: عومەر كەمال دەروێش |
| 3 | ئاشتینامە، وەلامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ن: ئامینە صدیق |
| 4 | فەتواكەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| 5 | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دكتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئا: ئارام عەلی سەعید |
| 6 | بەرەو بەختیاری ئافرەت "بەرگی یەكەم" | جەمال حەبیبوللا "بێدار" |
| 7 | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| 8 | بەجیهانیكردن، دیدێكی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید و: حەمەكەریم عەبدوللا |
| 9 | كوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیدا | ن: حەسەن مەحمود حەمەكەریم |
| 10 | بەرەو بەختیاریی ئافرەت "بەرگی دووەم" | ن: جەمال حەبیبوڵلا "بێدار" |
| 11 | مێژووی دێرینی كوردستان "بەرگی دووەم" | ن: فازل قەرەداغی |
| 12 | سەدەیەك تەمەنی نوورین، مامۆستا عەبدولكەریمی مودەڕیس بە پێنووسی خۆی بناسە | ئا: عەبدولدائیم مەعروف هەورامانی |
| 13 | دەوڵەتی خیلافەت، بوژاندنەوەی كۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانییەت | ن: ئیكرام كەریم |
| 14 | لە سەرگوزشتەكانی ژیان، ئەدەبی گاڵتەوگەپ، رووداوی مێژوویی، بیرەوەریی | ن: شێخ موحەممەد خاڵ |
| 15 | پرۆژەی دەستووری هەرێمی كوردستان رامان و سەرنج و پێشنیار | ئا: پرۆژەی تیشك |

| | | |
|---|---|---|
| 16 | بیستو سێ ساڵ سەروەریی | ن: ئەحمەد حاجی ڕەشید<br>دکتۆر صەباح بەرزنجی پێشەکی بۆ نووسیوە |
| 17 | قورئان وەحی ئاسمانە، نەك ڕەنگدانەوەی سەردەمی خۆی | ن: بەکر حەمەصدیق |
| 18 | ئیسلامو سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلامو سیاسەت | ن: ئارام قادر |
| 19 | سوپای ئەییوبیان لە سەرودەمی سەلاحەددیندا پێکهاتنی، ڕێکخستنی، چەکەکانی، هێزی دەریاییو شەڕو جەنگە گرنگەکانی | ن: پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن<br>و: عوسمان عەلی قادر |
| 20 | پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو | ن: عەبدوڕڕەحمان نەجمەدین |
| 21 | رۆڵی پرشنگداری زانا موسوڵمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا | ن: د. کاوە فەرەج سەعدون |
| 22 | یەکەمین دەستووری نووسراو لە جیهاندا، بەڵگەنامەیەکی گرنگی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ | ن: موحەممەد حەمیدوڵڵا<br>و: شوان هەورامی |
| 23 | ئیسلامناسیی یان ئیسلامنەناسیی، وەڵامێك بۆ کتێبی (ئیسلامناسی) عەلی میرفطروس | ن: ئیکرام کەریم |
| 24 | بەرەو بەختیاریی ئافرەت<br>"بەرگی سێیەم" | ن: جەمال حەبیبوڵلا<br>"بێدار" |
| 25 | ئیشکردن نەك تەمەڵی | عەبدولعەزیز پارەزانی |
| 26 | دوورگەی بیناسازان، چیرۆکێکی پەروەردەییە بۆ گەورەو بچووکی ئەم نەوە نوێیە | نووسینی: د. عەبدولحەمید ئەحمەد ئەبو سلێمان<br>وەرگێڕانی: ئامینە صدیق عەبدولعەزیز |
| 27 | زمانی گەردەلوول، خەونی شنەبا | فەرهاد شاکەلی |